بنەماکانی ڕێزو ڕەوشت

# چیرۆکە جیهانییەکان

کۆمەڵێك چیرۆکی
جیهانی هەڵبژاردە



www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

وەرگێڕانی: مامۆستا دیار ئەسعەد

# چیرۆکە جیهانییەکان







07701918565 - 07501571818

چاپ و بلاوکردنەوە

**ناوی کتێب:** چیرۆکەکانی منداڵی زیرەك

**وەرگێڕانی:** مامۆستا دیار ئەسعەد

**نۆبەتی چاپ:** چاپی سێهەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٦٧) پێدراوە

- مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە



# چیرۆکی شازادە سۆفیا و خوشکەکەی

من ناوم سۆفیایە، من وا ڕاهاتبووم هەمیشە من و دایکم پێکەوەبین بەڵام دایکم شووی کرد بە پاشا ڕۆلاند ، دایکم ئێستا شاژنی ئینچانسیا یە، وە منیش بووم بە شازادە، کێشەکە ئەوەیە کە من هیچ شتێک نازانم سەبارەت بە شازادەبوون، هەرگیز سڵاوی شاهانەم نەکردووە، نازانم چ کاتێک خۆم بچەمێنمەوە تەنانەت نازانم چ چەتاڵێک بەکاربهێنم بۆ نانی ئێوارە، وە هەرگیز نابم بە شازادەیەکی تەواو وەک ئامبەری زڕ خوشکم، من بەردەوام کێشەم لەگەڵ ئامبەر هەبوو، ئەو هەرگیز نەیدەویست من ببم بە شازادە، بەڵام دایکم پێم دەڵێ تەنها خۆت بە، پشت بە خۆت ببەست، ئەوەندە بەسە، بەڵام من دڵنیا نیم کە ئایا ئەو قسەیەی دایکم تا چەند بۆ من دەبێت چۆن دەتوانم لەیەک کاتدا هەم خۆم بم و هەم شازادەش؟. دواتر پاشا ڕۆلاند ..... ئم ئم ...... مەبەستم باوکە نوێیەکەم هەوڵدەدات یارمەتیم بدات، ئەو ملوانکەیەکی جوانی پێدام کە گەوهەرێکی پێوە بوو کە دەیپاراستی لە بەختی خراپ، باوکم دەڵێ ئەوە دیاری بە خێرهاتنی تۆیە بۆ ناو خانەوادەکەمان، زۆربەی شازادەکانی پێش من لە ملیان کردووە، دواتر



پێی ووتم: لەسەر ڕێزی من ئاهەنگێکی شاهانە ڕێک دەخرێت کە هەموومان سەما دەکەین، یەکەم سەماو مۆسیقای والتز پێکەوە، ئەمەش شتێکی ترە کە نازانم سەما بکەم! ڕەنگە وانەی فێربوونی سەما هەبێت لە خوێندنگا نوێیەکەم (پەیمانگای ئامادەکردنی شاهانە) وە سێ مامۆستای ئەفسانەیم هەیە کە ناویان فلۆراو فاونا و مێری وێزە، ئەوان بەڵێنی ئەوەیان دا کە هەموو شتێکم فێربکەن سەبارەت بەوەی کە چۆن ببم بە شازادە، زۆرباشە! ئێستا من وانەی سەمام هەیە، ئامبەری زڕ خوشکم هەندێک پێڵاوی تایبەتی پێدام وا هەست دەکەم کە ئەو خەریکە منی بە دڵ دەبێت و خۆشی دەوێم. وتم ئۆە .. نا ئامبەر فێڵی لێکردم، ئەو پێڵاوانەی کە پێی داوم سیحراوین و منی کەواند بەو هۆیەوە تەواوی پۆلەکە پێم پێکەنین، خۆم زانیم زڕ خوشکەکەم لەگەڵ باش نابێت، بەڵام لەوەش خراپتر من هێشتا فێری سەمای واڵتز نەبوم و ئاهەنگەکەش ئەمشەو دەست پێدەکات، بۆیە داوام لە جادووگەری شاهانە سیدرک کرد تا یارمەتیم بدات ئەو هەندێک وشەی جادووگەرانەی بۆ نوسیم ئەو ئەڵێ ئەگەر ووشەکان بخوێنمەوە لە ئاهەنگەکەدا ئەوا دەتوانم سەمای واڵتز بکەم



وەکو شازادەیەکی ڕاستەقینە، جەیمس زڕ براکەم دەڵێ کە هەموو جۆرێک وشەی جادووگەرانەی هەیە، کە شەو هات پاشا ووتی: سەما بکەین؟ بەڵام من دەستم بە سەما نەکرد وشەکانی سیدرکم خوێندەوە (سۆمین بەس پۆپۆلیس سیل) لە جیاتی ئەوە تەواوی ئامادەبووان خەویان لێکەوت تەنانەت پاشا رۆلاندیش، ئۆە .... نا ....! من چیم کرد؟ لە پڕ هاوارم کرد (یارمەتی!) بینیم گەوهەری ملوانکەکەم گەورەبوو و سەندرێلا دەرکەوت، شازادە سەندرێلا یەکێک بوو لەو شازادانەی بەدەست زڕ خوشکەکانیەوە گیری خواردبوو، پەرێشان بوو، بۆیە بۆ هاوکاری کردنم دەرکەوت، سەندرێلا ووتی: گەوهەرەکەی ملت منی هێنایە ئێرە، کاتێک شازادەیەک لە کێشەدایە کەسێکی تر دێت بۆ یارمەتی دانی، سۆفیا لێی پرسی سەندرێلا ئەتوانی ئەو جادووە بگێڕیتەوە؟ سەندرێلاوتی نا من ناتوانم بەڵام ڕەنگە خوشکە نوێیەکەت بتوانێ یارمەتیت بدات، سۆفیا وەڵامی دایەوە وتی: بەڵام ئامبەر زۆر چاوچنۆکە بۆ من! سەندرێلا دەیزانی هەبوونی خوشکێکی چاوچنۆک واتای چی، ووتی: خۆزگە دەخوازم کە چانسێکی ترم بدایە بە زڕ خوشکەکەم، ڕەنگە ئەوە ئەوەبێت کە ئامبەر پێویستیێتی، وای وت و لە چاو وون بوو، مەبەستی سەندرێلا لەوە بوو کە شازادە سۆفیا کینەی خوشکەکەی لە دڵ نەگرێت و هاوکاری یەک بن،




شازادە سۆفیا وتی ئامبەر هێشتا لە ژوورەکەی خۆیەتی، ئەو هێشتا نەهاتووە بۆ ئاهەنگەکە، لە کۆتایدا پێم وت: کە بۆچی هێندە قرچۆک و چاوچنۆکە بەرامبەرم، بە خەمبارییەوە ووتی: من نیگەرانی ئەوەم کە هەموو کەسێک تۆی زیاتر لە من خۆش بوێت، پێم ووت: هیچ کەسێک هەرگیز نابێت بە شازادەیەکی تەواوی وەک تۆ ئامبەر! من سەبارەت بە ووشە سیحراوییەکانی سیدرک هەموو شتێکم بۆ ئامبەر باس کرد، پێکەوە بە ناو شتەکانیدا گەڕاین، ئەو جادووییەمان دۆزیەوە کە هەموویان لە خەو هەڵدەستێنێ هەردووکمان بە پەلە چووین بۆ هۆڵی ئاهەنگەکە، ئامبەر ووتی: چاوەڕێکە من وانەیەکی سەمامت بە قەرز دەدەمێ، سۆفیا وتی: ئێستا زانیم کە ئێمە خوشکی ڕاستەقینەین و هاوڕێی هەمیشەیی یەکترین. کاتێک گەیشتینە هۆڵی ئاهەنگەکە ووشە سیحراوییەکەم ووت و هەموویان بە ئاگا هاتنەوە دواتر من و پاشا دەستمان کرد بە سەمای واڵتز، تەماشایەکی ئامبەرم کرد و زەردەخەنەیەکم بۆ کرد، بڕوام نەدەکرد کە چەندە دڵ خۆش بووم، وام بیردە کردەوە کە دواجار تەواو گونجاوم لەگەڵ ئەو خانەوادەیە شاهانەیە. باوکم بانگی کردم و پێی وتم: من زۆر شانازیت پێوە



دەکەم زۆر بە جوانی سەمات دەکرد، وەڵامم دایەوەو وتم: سوپاس گەورەم...... مەبەستم باوکە، باوکم وتی: دەزانی سۆفیا بوون بە شازادە بە مانای هەبوونی دڵێکی باش دێت وە هەروەها تۆ دەبیتە شازادەیەکی زۆر مەزن، بەباوکمم وت: باوکە من سەرم سوڕماوە ... بۆچی پێت دەڵێن پاشا ڕۆلاندی دووەم؟ باوکم وەڵامی دامەوەو وتی: چونکە باوکیشم ناوی ڕۆلاند بووە، ئەو پاشا ڕۆناڵدی یەکەم بوو، « زۆر باشە ...کەواتە ئەوە وا دەکات کە من ناوم سۆفیای یەکەم بێت، وە من شازادەیەکم کە ناتوانم چاوەڕێ بکەم ئەوە ببینم چی ڕوودەدات بەیانی، تەواوی ڕۆژەکان زۆر خۆش دەبن، ئێوەش مندالە خۆشەویستەکان دەتوانن ڕق و کینەکانتان بەرامبەر خوشکەکانتان لە یاد بکەن و بە خۆش و خۆشەویستییەوە لەگەڵیاندا بژین، وە هەمووتا شایەنی بوون بە شازادەن.



# شازادە سۆفیا و خشڵە نهێنیەکە

من سۆفیام بوون بە شازادە زۆر خۆشە، خێزانەکەم گەشت دەکەن بۆ چەندین شوێنی سەرنج ڕاکێش و خۆش، شوێنی دوورو نزیک، ئەمڕۆ ئێمە سەردانی شانشینی (وی لینگ) دەکەین کە هاورێکانمان شازادە (جەن و بیر جینی) لێ دەژین. تۆزێک دوای ئەوەی ئێمە گەیشتین، جەیمس و جین نەخشەی گەنجینەی پڵنگە بەدناوەکەیان دۆزیبووەوە، پێش ئەوەی ئێمە پێیان بزانین ئەوان ڕۆشتبوون بۆ دۆزینەوەی گەنجینەکە، کاتێک ئەم هەواڵەمان بە باوکی جین پاشا کوون ووت ئەو زۆر نیگەران بوو، ووتی: پڵنگی ڕاستەقینە پاسەوانی ئەو گەنجینەیە دەکات پێویستە ڕێگریان لێ بکەین، دەی با بڕۆین، من ووتم: ئێمە دەمانەوێت لەگەڵ ئێوە بێین و یارمەتیتان بدەین، بەڵام پاشا ووتی ئەوە زۆر ترسناکە، پاشا وای ووت و لەگەڵ باوکم بەپەلە ڕۆشتن. من زۆر زۆر نیگەران بووم بە تایبەت کاتێک (ۆو چانگ) جادووگەری شاهانە سەبارەت بە تەڵەکە شتی پێ ووتین کە پڵنگ دانراوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە گەنجینەکە بکات، براکانمان و باوکمان ڕەنگە بکەونە تەڵەکەوە، (ۆو چانگ) ئەوەی بۆ ڕوون




کردینەوە کە چۆن ئەشکەوتی پڵنگەکە بدۆزینەوە هەروەها دەروازەیەکی نهێنی پێ ووتین، ئێمە ڕێگەکەمان گرتە بەر بەڵام زۆری پێنەچوو هەندێک پەیکەری بەردی زەبەلاحمان بینی کە ڕێگاکەیان لێ داخستین جەن هاواری کرد: ئەو پەیکەرە جوڵا! ئامبەر سەرێکی لەقاند و ووتی: سۆفیا ئەمە زۆر ترسناکە، پێم ووت: با جارێکی تر هەوڵ بدەینەوە، کێشە نەبوو کە بە چ ڕێگایەکدا بڕۆین بەڵام پەیکەرەکان ڕێگاکەیان لێ دادەخستین، ئامبەر و جەن بێ هیوا ببوون، جەن ووتی: ئەگەر ئێمە نەتوانین ئەم پەیکەرانە تێپەڕێنین ئەوا چۆن دەتوانین پڵنگەکان ببەزێنین؟ ڕەنگە قسەکانی ئامبەر و جەن ڕاست بن و بگەڕێنەوە. دواتر تێبینیم کرد ئەو گەوهەرەی کە بە ملوانکەکەی منەوە بوو درەوشایەوەو کە ئاوڕمان دایەوە (شازادە مولان)ی لێ بوو، بە پێکەنینەوە پرسیاری لێ کردین: بە نیازن ئێوە بەرەو کوێ بچن؟، من هەرگیز بە ئاسانی کۆڵم نەداوە، وە نابێ ئێوەش بە ئاسانی کۆڵ بدەن، ئێوەی کچان زۆر ئازاترن لەوەی کە دەیزانن، مولان یارمەتی دام بازبدەمە سەر یەکێک لە پەیکەرەکان و بازم دا بۆ سەر پەیکەرێکی تر لەوەوە بۆ سەردانەیەکی تر، ئامبەر و جەن بینیان کە ئەوانیش دەتوانن هەمان کار بکەن، ئامبەری زڕخوشکم هاواری



کرد: ئەنجاممان دا!، شازادەمولان ووتی: پێویستە بەسەر هەر شتێکدا بڕۆن کە دێتە سەر ڕێگەکەتان. ئێمە بەردەوام بووین لە ڕۆشتن بەڵام کاتێک ئاوڕم دایەوە بینیم کە شازادە مولان لەوێ نەما بوو، پاش ماوەیەک لە بەردەوام بوون لە ڕێگا دوورەکە گوێمان لە دەنگی زیکە زیک بوو، لەناکاو بە کۆمەڵێک مێشوولەی پەپولە ئاسا دەورەدراین ئەوەندە زۆر بوون کە نەمان دەتوانی ببینین کەبەرەو کوێ دەڕۆین! ئامبەر بە باوەشێنەکەی دەستی مێشوولەکانی دوور دەخستەوە ووتی: تۆ بڵێی من بهێڵم کە ئەو هەموو مێشوولەیە بەسەر سەرمەوە بن؟ پێم ووت: واو .....ئامبەر ئەوە زۆر سەر سوڕ هێنەر بوو! ئامبەر باوەشێنەکەی دەستی قەد کردوو ووتی: ئێستا من ئامادەم بەرەنگاری پڵنگەکە ببمەوە، بە ئامبەرم ووت: زۆر دڵ خۆش بووم کە هەست بە ئازایەتیەکی زیاتر دەکەیت، ئێمە پێویستمان بە هەموو یارمەتیەک هەیە کە دەستمان دەکەوێت!. لەبەردەوامی ڕێگەکەیان ڕێمان کەوتە گۆمێکی ئاوەوە کە لێواری ئاوەکە مارمێلکەی زۆر گەورەی لێ بوو، جەن ووتی: ئەمانە چاو برسیترین مارمێلکەن لەم ناوچەیەدا، ئامبەر هەوڵی دا نزیکترین مارمێلکە لە خۆی دوور بخاتەوە بە باوەشێنەکەی دەستی بەڵام بەشی قەپاڵێکی گەورەی ئەو دەکات! جەن ووتی: شتێکم بیرکەوتەوە مۆسیقا مارمێلکەکان هێور دەکاتەوە، بۆیە فلوتەکەی دەرهێناو دەستی



کرد بە موزیک ژەنین وەکو جادوویەک مارمێلکەکان لە گازگرتن وەستان و بە دەنگی مۆسیقاکە لار بوونەوە چوومە لای یەکێک لە مارمێلکەکان و چرپاندم بە گوێیدا، بەڕێز مارمێلکە دەتوانی بمانبەیتە ئەو بەری ئاوەکە؟ مارمێلکەکە وەڵامی دایەوە و ووتی: تا ئەو کاتەی گوێمان لە مۆسیقا دەبێت ئێمە دڵ خۆش دەبین، بانگی ئامبەر و جەنم کرد و پێم ووتن: تەماشا بکەن ئەم مارمێلکانە ئێمە دەپەڕێننەوە بۆ ئەو بەری ئاوەکە با سواری پشتیان ببین، جەن بەردەوام بوو لە ژەنینی فلوتەکەو مارمێلکەکانیش ئێمەیان بە سەلامەتی گەیاندە ئەو بەری ئاوەکە، لەوبەری ئاوەکە تاڤگەیەکی لێ بوو دواتر تێبینی شتێکم کرد لە پشت ئاوەکەوە دەروازەی نهێنی ئەشکەوتەکە بوو کە (ۆو چەنگ) پێی ووتین. بە ڕێڕەوێکی تەسکدا چووینە ناو ئەشکەوتەکەوە، ئامبەر هاواری کرد: تەماشای ئەو هەموو خشڵە بکەن! هاوارم کرد: جەیمس باوکمان! باوکمان زۆر سەر سام دیار بوو ووتی: کچینە نابێت ئێوە لێرە بن. لە ناکاو پڵنگە بەدناوەکە لە پشت گەنجینەکەوە بازی داو نەڕاندی! ئامبەر و جەن خۆیان شاردەوە بەڵام کات زۆر درەنگ بوو بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە، پێویست بوو خێزانەکەمان بپارێزین، من بیرۆکەیەکم هەبوو! پڕ بە دەستم خشڵم گرت بە دەستمەوە و بە پڵنگەکەم ووت: تۆ دەتەوێت ئەمانەم لێ بسێنیت؟ دەی بمگرە! ڕام



کرد بەرەو ڕاڕەوە تەسکەکە پڵنگەکەش بە دوامدا هات و لە ڕاڕەوەکەدا گیری خوارد و نەڕاندی، من گیرم خوارد! منیش ووتم: ئەوە پلانەکەم بوو، پێویستە تۆ ڕێگە بە خێزان و هاوڕێکانم بدەیت بڕۆن، پڵنگەکە وتی: دوای ئەوەی کە ئەوان هەوڵیان دا گەنجینەکەم ببەن؟ وەڵامم دایەوە، ئێمە تەنانەت یەک پارچەی بچوکی گەنجینەکەی تۆمان ناوێ ئێمە دەمانەوێت خێزانەکەمان بگەڕێتەوە، پڵنگەکە ڕازی بوو کە ڕێگەیان بدات بڕۆن، دواتر داوای یارمەتیم لە ئامبەر و جەن کرد تا لە ڕاڕەوە دەری بهێنن، گوریسێکمان دۆزیەوە تا پێی ببەرێینەوە، دوای ئەوەی کە ئەشکەوتەکەمان بە جێ هێشت پاسەوانەکانی (وۆ چەنگ) گەیشتنە ئەوێ، ئامبەر بە لەخۆباییانەوە ووتی: ئێوە زۆر دوا کەوتن، پاشا کوون پێکەنی و ووتی: بەڵێ شازادە ئێمەی ڕزگار کرد! باوکمان بیریان لەوە نەکردبووە کە ئێمە دەتوانین ئەوە بکەین بەڵام ئەوان زۆر شانازیان بە ئێمەوە دەکرد، لە شەودا یاریەکی ئاگرینی جوان ڕێک خرا بە بۆنەی ئازاترین سێ ڕزگارکەرەکەی ناوچەکە، بۆیە منداڵە شیرینەکان نابێت لەبەر زێڕ و زیو ژیانی خۆتان بخەنە مەترسیەوە، وە ئێمەی کچان وەک کوڕان توانی چاو نەترسی و ئازایەتیمان هەیە.



# سۆفیا نەفرەتی شازادە ئیڤی

ئەمە سۆفیایە، کاتێک بوو بە شازادە باوکە نوێیەکەی پاشا ڕۆلاند ملوانکەیەکی پێدا کە گەوهەرێکی سیحراوی پێوە بوو، کە هێزێکی ئەوەی پێدابوو وتووێژ لەگەڵ ئاژەڵەکاندا بکات و بتوانێ لێیان تێبگات، نەدەبوو کەس بەم نهێنیە بزانێت بەڵام ڕۆژێکیان ئامبەری زڕ خوشکی گوێی لە سۆفیا بوو کە قسەی لەگەڵ کەروێشکەکەیدا دەکرد کە ناوی کلۆڤەر بوو دەکرد، ئامبەر لێی پرسی: تۆ وا دەردەکەوێت لەوەی تێ دەگەیت کلۆڤەر چی دەیوت، چی ڕوودەدات؟ هەرچەندە سۆفیا ناچار نەبوو کە سیحری گەوهەرەکە بە هەموو کەسێک بڵێت بەڵام نەیدەتوانی درۆ لەگەڵ ئامبەری خوشکیدا بکات بۆیە سۆفیا ڕاستیەکەی بە ئامبەر ووت: ئەم گەوهەرە سیحراویە وە بانگی شازادەکان دەکات هەر کاتێک پێویستی پێیان بێت وەهەروەها یارمەتیم دەدات لە زمانی ئاژەڵەکان تێبگەم. ئامبەر وتی: ئەمە زۆر سەر سوڕهێنەرە! دەتوانم تاقی بکەمەوە؟ سۆفیا بە بێ ئەوەی دڵی خوشکەکەی بیەشێنێت پێی ووت: نەخێر، بەڵام ئامبەر جۆرێک لە نیگەرانی پێوە دیار بوو، خۆش بەختانە نیگەرانیەکەی ئامبەر زۆری نەخایاند لەگەڵ ئەوەشدا ویستی ئەو شەوە لەگەڵ سۆفیا پێکەوە بخەون. بەڵام بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر کاتێک



سۆفیا لە خەو هەستا ئامبەر لەوێ نەمابوو لەگەڵ ئەودا گەوهەرە سیحراویەکەش نەمابوو! لە دڵی خۆیدا سۆفیا ووتی: تۆ بڵێی ئامبەر گەوهەرەکەی بردبێ؟ سۆفیا هەموو شوێنێک گەڕا لە کۆتایدا ئامبەری لە باخچەکەدا دۆزیەوە کە گەوهەرەکەی لە مل کردبوو ئامبەر ووتی: تەنها ویستم تاقی بکەمەوە، دواتر داوای لە گەوهەرەکە کرد کە شازادەیەکی بۆ بهێنێت ، گەوهەرەکە دەستی کرد بە درەوشانەوە، ئامبەر سەرسام بوو بەڵام سۆفیا شپرزە بوو ووتی: هەمیشە گەوهەرەکە تەنها ئەو کاتانە شازادە دەنێرێ کە من پێویستم پێی بێت، سۆفیا شازادەکەی نەناسیەوە ووتی: ئەوە کێیە؟ شازادەکە ووتی من شازادە ئیڤیم، من لێرەم تاکو دەست بەسەر شانشینەکەی ئێوەدا بگرم وە هەروەها بە بێ ئەو گەوهەرە کەس ناتوانێ من بوەستێنێت. کتو پڕ یەکێک لە پەپولە ڕەش و سپیەکانی کردی بە گەوهەرەکەدا و بردی بۆ شازادە ئیڤی، سۆفیا هاواری کرد، بمدەرەوە! سۆفیا بانگی پاسەوانێکی کرد تاکو ئیڤی بگرێت بەڵام ئیڤی لە ڕێگەی پەپولەیەکی سیحراویەوە خەیاڵی پاسەوانەکەی برد و پاسەوانەکە نەیدەزانی بۆچی هاتووە و دەبێت چی بکات ووتی: من لە کوێم؟! ئۆه ...نا! پەپولەکەی ئیڤی خەیاڵ و هزری پاسەوانەکەی بردووە، ئیڤی ووتی: دوای ئەوەی کە گەوهەرەکەم تێک شکاند دێمەوە بۆ تاجەکە، بەڵام سۆفیا هاواری کرد، تۆ ناتوانی تێکی بشکێنی،



ئیڤی بەپەلە رۆشت و ووتی: ئۆە.. دەتوانم و وە دەشی کەم، ئامبەر ووتی: چۆن بمزانیایە کە گەوهەرەکە بانگی شازادەیەکی شەڕ خواز دەکات؟ دواتر سۆفیا یاساکانی گەوهەرە سیحراویەکەی وەبیر هاتەوە بە ئامبەری ووت: تۆ گەوهەرەکەت دزیەوە بۆیە پێدەچێت نەفرەتی لە تۆ کردبێت کە ئیڤی هێناوە تە ئێرە. ئەوان پێویستیان بە یارمەتی بوو بۆیە چوون بۆ لای سیدرک، ئەو ووتی: تەنها ئاگرە هەمیشە سوتاوەکەی ئەژدیهاکە دەتوانێ زیان بە گەوهەرە سیحراویەکە بگەیەنێت، ئەوەش دەکەوێتە لوتکەی ڕاگرێکی ئاگرینەوە کەس بەو شوێنە نازانێ جگە لە ئێمە، لەو کاتەدا سۆفیا گوێی لە ترپە ترپێک بوو، هاواری کرد ئۆە.. نا یەکێک لە پەپولەکانی ئیڤی گوێی لەو شتانە بوو کە سیدریک پێی ووتین، سۆفیا و سیدرک و ئامبەر دوای پەپولەکە کەوتن بەڵام نەیانتوانی بیوەستێنن لەوەی کە سەبارەت بە ئاگرە هەمیشە سوتاوەکە بە ئیڤی دەڵێت، هەر کە ئیڤی بە هەواڵەکەی زانی یەکسەر فڕی تاکو ئەو شوێنە بدۆزێتەوە و پەپولەکانی بە جێ هێشت تاکو ئینچانسیا بکات بە ڕەش و سپی!، ئەگەر بێت و ئێمە گەوهەرەکە بپارێزین ئەوا ئەو نەفرەتیە هەڵدەوەشێتەوە، سۆفیا وای ووت و هەموویان فڕین بۆ لای ڕاگرە ئاگرینەکەوەو لە تەنیشت گالیسکەکەی ئیڤی یەوە نیشتنەوە، ئامبەر ووتی: چاوەڕێ بکەن پێویستە ئێمە بە و ڕێگایەدا سەر بکەوین، سۆفیا وتی:



بەڵێ ئامبەر ئێمە وا دەکەین، ئەو ڕێگایەی گرت کە بە ڕێچکەیەکی سەختدا دەڕۆیشت، سۆفیا ئاواتە خواز بوو کە زۆر دوا نەکەوتبێ. لە کۆتایدا گەیشتە ئەو ئەشکەوتەی کەلە نزیک لوتکەکەوە بوو، بە دوای ئاگرە هەمیشە سوتاوەکەدا دەگەڕان بەڵام نەیان بینی، ئیڤی یشیان نەبینی بە ڵام سۆفیا دڵنیا بوو لەوەی کەلە شوێنێکدایە، لەناکاو گوێیان لە دەنگی گۆرانیەک بوو، سۆفیا وتی: سڵاو! چوار ئەژدیها دەرکەوتن زۆر باش دیار بوون، سۆفیا پرسیاری لێکردن لە کوێ ئاگرە هەمیشە سوتاوەکە بدۆزنەوە، یەکێک لە ئەژدیهاکان ووتی: ئێمە خۆش حاڵ دەبین کە پێتی بڵێین، یەکێکی تریان ووتی: ڕاستەوخۆ دوای ئەم نمایشە، سۆفیا و ئامبەر و سیدرک هەوڵیان دا کە بۆیان ڕوون بکەنەوە کە پەلەیانە بەڵام ئەژدیهاکان دەستیان کرد بە گۆرانی ووتن. ئەژدیهاکان گۆرانیەکەیان تەواو کرد و بە سۆفیاو سیدرک و ئامبەریان ووت کە بچن بۆ کوێ بەڵام کاتێک کە گەیشتنە ئەو ئەشکەوتەی کە ئاگرە هەمیشە سوتاوەکەی لێیە، شازادە ئیڤی لەوێ بوو، وە خەریک بوو گەوهەرەکەی دەتواندەوە. لە چاو تروکانێکدا سیدرک کۆمەڵێک باڵندەی بە دەوری ئیڤی دا بڵاوکردەوە تاکو بەر چاوی بگرێت و هیچ نەبینێت،



ئامبەر کردی بە گەوهەرەکەدا و هەڵیدا بۆ سۆفیا بەڵام ئەمە هێشتا نەفرەتیەکەی لەناو نەبردووە چونکە ئیڤی هێشتا لەوێ بوو، ئیڤی پەپولەیەکی نارد بۆ سیدرک تاکو هزری لە دەست بدات دواتر ویستی هزری سۆفیا و ئامبەریش ببات بەڵام هەردووکیان ڕایانکرد بەڵام کەوتنە ناو چاڵێکی گەورەوە خۆش بە ختانە ئیڤی نەیدەتوانی دەستی پێیان بگات بەڵام لەو چاڵەدا گیریان خواردبوو، ئیڤی وتی: دەگەڕێمەوە بۆ گەوهەرەکە دوای ئەوەی کە دەست بەسەر شانشینەکەدا دەگرم، ئامبەر ووتی: بمبورە خوشکێکی باش نەبووم بۆت، ئەمانەی کە ڕوویان دا هەمووی بە هۆی هەڵەی منەوە بوو، سۆفیا نەیدەتوانی لێی دڵ گران بێت ووتی: کێشە نیە بەڵام چۆن لێرە ڕزگارمان بێت؟ لەناکاو بینی گەوهەرەکە دەدرەو شێتەوە. لەو کاتەدا ڕووناکیەک پەیدا بوو لەگەڵیدا شازادا ڕاپۆنزیل دەرکەوت، قژە جوان و درێژەکەی شۆڕکردەوە ووتی: پێیدا سەرکەون، دوای ئەوەی ڕاپۆنزیل یارمەتی دان و ڕزگاری کردن، سۆفیا باسی شازادە ئیڤی بۆکرد، ئامبەر لێی پرسی: چۆن دەتوانین بیوەستێنین؟ دواتر ئەو ئەژدیهایانەی کە گۆڕانیان بۆ سۆفیا و ئامبەر و سیدرک ووت ئەوانیان خستە سەر پشتیان و وویستیان بیان بەنەوە بۆ قەڵاکە لەو کاتەی لە ڕێگادا بوون، ڕاپۆنزیل ئەوەی ڕوون کردەوە کە چۆن ئەو نەفرەتیە بوەستێنن ووتی: ئامبەر پێویستە کارێک بکات بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێت کە



سۆفیا زۆر زیاتر گرنگترە لە خۆی، دواتر بە هەورەکاندا فڕین و کاتێک سۆفیا ئاوڕی دایەوە بینی ڕاپۆنزیل ڕۆشتووە، کاتێک کچەکان گەیشتنە قەڵاکە، گالیسکەکەی ئیڤی لەوێ بوو، هەموو شتێک ببوو بە ڕەش و سپی، سۆفیا هیوای ئەوەی دەخواست کە زۆر دوا نەکەوتبێت. ئۆە..نا شازادە ئیڤی پەپولەکانی پەلاماری خانەوادەکەیانی داوە و داوای گەوهەرە سیحراویەکەی سۆفیا دەکات ، یەکێک لە پەپولەکانی نارد بەرەو سۆفیا بەڵام پێش ئەوەی سۆفیا بجوڵێ ئامبەر بازی داو چووە بەردەم سۆفیا، سۆفیا هاواری کرد ئامبەر .. تۆ باشیت؟ ئیڤی ووتی: پێویستە تۆ خۆت ئاگات لە خۆت بێت، وای ووت و یەکێک لە پەپولەکانی بۆ نارد بەڵام پێوەی داو وون بوو، ئیڤی سەری سوڕما! چی ..من چی؟ دەنگی کز کز ببوو، ئامبەر خۆی خستە بەردەم پەپولەکانی ئیڤی تاکو سۆفیا بپارێزێت، ئیڤی هاواری کرد، ئەمە نابێت و لە کۆتا درەو شانەوەیدا وون بوو و هەموو ڕەنگەکان گەڕانەوە بۆ شانشینەکە و نەفرەتیەکە کۆتایی هات. پاشا ڕۆلاند بە سەر سامیەوە پرسی: چی ڕوویدا؟ کەس هیچ شتێکی بیر نەمابوو سوپاس بۆ ئەو پەپولانە ... ئەمەش بە مانای ئەوە دێت کە هێشتا گەوهەرەکەی سۆفیا بە نهێنی ماوەتەوە، وە ئێستا سۆفیا نهێنیەکی تری بۆ دەرکەوت کە ئامبەر بە ڕاستی باشترین خوشکە.



# سۆفیا و كۆشكی سەر ئاو كەوتوو

من سۆفیام، زۆر حەز دەكەم شازادە بم، بۆ پشووی هاوینەمان خێزانەكەم سەردانی كەنداوی میرۆوەی دەكات، لەسەر كەشتیەكەمان كە زۆر گەورەیە و وەكو كۆشكێكی سەر ئاو كەوتووە، دواتر من كتێبم دەخوێندەوە سەبارەت بە پەریەكانی دەریا، ڕەنگە یەكێك لەو پەری دەریا یان لە كەنداوەكەدا ببینن، هیوا خوازم! بەڵام باوكم ئەڵێ پەری دەریا لە ژیانی ڕاستەقینەدا بوونی نیە، باوكم، پاشا ڕۆلاند هەمیشە قسەكانی ڕاست بووە سەبارەت بە زۆربەی شتەكان، بەڵام سەبارەت بە پەری دەریا نەخێر، چونكە كاتێك كە چوومە سە رتەختی كەشتیەكە پەریەكی دەریای ڕاستەقینەم بینی هاواری كرد: یارمەتی! ئۆو...نا ئەو پەری دەریایە لە تۆڕێكی ڕاوكردندا گیری خواردووە، پێم ووت: ڕێم بدە با یارمەتیت بدەم، ڕاتدەكێشمە سەر كەشتیەكەو ڕزگارت دەكەم، زۆر جوان بوو ناوی ئوونا بوو دواتر ئەو ووتی: سوپاس، پێویستە من بڕۆم، ئێمە نابێت كات بە فیڕۆ بدەین لەسەر ڕووی ئاو، بەڵام كاتێك ئوونا چووە ناو ئاوەكە نەیدەتوانی مەلە بكات پەڕەكەی ئازاری پێگەیشتبوو، لەو كاتەی كە ویستم خۆم شۆڕ بكەمەوە بەرەو ئاوەكە تا یارمەتی بدەم، گەوهەرەكەی ملم درەوشایەوەو بووم بە پەری دەریا!. نەمدەتوانی بڕوا بكەم تەنانەت ئووناش نەیدەتوانی



باوەڕ بکات پرسیاری کرد: تۆ چۆن ئەوەت کرد؟ باسی گەوهەرە سیحراویەکەی ملم بۆ کرد، ئووناش هاوشێوەی من شانەیەکی سیحراوی بە قژیەوە بوو، ئوونا ووتی: بەڵام نازانم هێزی ئەم شانەیە لە چیدایە دایکم ئەڵێ گەورەتر بیت پێتی ئەڵێم، یارمەتی ئوونام دا تاکو بەرەو ماڵی خۆیان مەلەی کرد، لە ژێر ئاوەکەدا بەلای سەدان ماسی جوان و گژوگیا و چەندان شتی تری جواندا تێپەڕین، کاتێک گەیشتینە نزیک ماڵی ئوونا من هاوڕێیەکەیم بینی ئەسپێکی دەریا بوو ناوی سیڤن بوو وە هەروەها کوڕای خوشکە گەورەی، ئەوان جۆرە گژوگیایەکیان بەکارهێنا بۆ چارەسەرکردنی کلکی. لەناکاو ئاوەکە تاریک بوو کۆشکی سەر ئاو کەوتووەکەمان لەسەرووی ئێمەوە وەستا، گوێمان لە دایکی ئوونا بوو کە بانگی ئوونا و کوڕای کرد کە بگەڕێنەوە ماڵەوە، دایکی ئوونا شاژن بوو ووتی: کەشتیەکی مرۆڤەکان لێرەیە، وە هەروەها ترسناکن، بەڵام من ترسناک نیم تەنانەت خانەوادەکەشم شازادە ئیمەلاین ئەوەی نەدەزانی، دەیویست ڕەشەبایەکی بە هێز دروست بکات لە ڕێگەی ئەو جادوویەی کە هەیبوو ڕەشەبایەک کە بتوانێ کۆشکە سەر ئاو کەوتووەکە لە کەنداوەکەدا دەربکات تەنانەت نوقمیشی بکات، خێزانەکەم لەسەر کەشتیەکەن! بۆیە بە ئیمەلاینی



دایکی ئوونام ووت: من مرۆڤم دەتوانم بچمە لای کەشتیەکە و ئێرە بە جێ بهێڵین، تکایە نوقمی مەکە و هەلێکی ترم بدەرێ، خۆش بەختانە شاژن ڕازی بوو و ئووناو کۆرا هیوای بەختێکی باشیان بۆ خواستم. من دەستم کرد بە مەلە کردن بەرەو کەشتیەکەمان، لەناکاو گوێم لە ئوونا بوو بانگی کردم، کە ئاوڕم دایەوە ئەسپێکی دەریایی ناشرینی ترسناک بە دوای ئوناوەیە، کە دەیویست شانە سیحراویەکەی لێ بسێنێت، من بە دوایاندا ڕۆشتم بە خێرایی هەرچەند کەلە توانامدا بوو، دواتر چوونە ناو گژوگیایەکی چڕەوە، هاوارم کرد: ئوونا، بەڵام هیچ وەڵامێک نەبوو. بەپەلە گەڕامەوە بۆ لای دایکی ئوونا و پێم ووت کە چی ڕوویداوە، پێی ووتم کە تا کاتی خۆر ئاوا بوون کاتت هەیە کە ئوونا ڕزگار بکەیت ، شازادە ووتی ئەگەر نەتوانی ئوونا ڕزگار بکەی ئەوا کەشتیەکە نوقم دەکەم، چوومەوە بۆ لای کەشتیەکە بەڵام خانەوادەکەم بڕوایان بە پەری دەریا نیە، بۆیە هەندێک لەو هاوڕێیانەم کۆکردەوە کە بڕوایان پێیەتی لەوانە سیڤن و کلۆڤەر و نەورەسێک کە ناوی فارلی بوو. لە کۆتاییدا ئێمە ئوونامان دۆزییەوە کە دێوەکەی دەریا لە تەڵەیەکدا زیندانی کردبوو وە خەریک بوو شانە سیحراویەکەی لێ دەسەند، هەوڵم دا کە بیوەستێنم بەڵام هێندە بە هێز بوو کە خەریک بوو منیش بگرێت، ئو...نا شاژنە ئیمەلاین هەورە بروسکەیەکی بەهێزی لەسەر کەنداوۆکە دروست کرد، پێویست بوو ئوونا ڕزگاربکەم پێش ئەوەی دایکی کەشتی خێزانەکەم نوقم بکات، نەمدەزانی چی بکەم. سیڤن پێی وتم: ئۆو...



ملوانکەکەت دەدرەوشێتەوە، کاتێک بەرەو ژێر ئاوەکە ڕۆشتین شازادە ئێریەڵ دەرکەوت، گەوهەرەکەی ملم ئەوی هێنا بوو بۆ ئێرە تاکو یارمەتیم بدات، بۆیە سەبارەت بە ئوونا پێم ووت: هەوڵم داوە ڕزگاری بکەم، بەڵام ... شازادە ئێریەڵ ووتی: تۆ پێویستت بە یارمەتی منە، ئەو پێی ووتم کە مرۆڤەکان و پەریەکان خێزانەکانی خۆیان خۆش دەوێت، وە ئەگەر پێکەوە کار بکەن ...ئێستا زانیم کە پێویستە چی بکەم. من و سیڤن گەڕاین تاکو کۆرای خوشکی ئووناومان دۆزیەوە وە سەبارەت بە دێوەکەی دەریا ڕووداوەکانم بۆ گێڕایەوە، کۆرا ووتی: دێوەکە بە دوای شانە سیحراویەکەی ئووناوەیە تەنها ڕێگە بۆ ئەوەی ڕزگاری بکەین ئەوەیە پێکەوە کار بکەین وام پێ ووت و هەردووکمان چووینە سەرووی دەریاکە بۆ لای ئوونا، سیڤن و فارلی و کلۆڤەریش یارمەتیان داین. پێویست بوو من بچمە ناو ئەو کەشتیەی کە دێوەکە ئوونای تێدا زیندانی کردبوو، کە گەیشتمە ئەویێ دێوەکە خەریک بوو جادوویەک لە ئوونا بکات و شانە سیحراویەکەی ئوونا ببات بۆ خۆی بەڵام من بە زۆر شانەکەیم لە دەستی دەر هێناو لێم سەند، دێوەکە ووتی: ئەو شانەیەم بدەرێ منیش ڕێگە دەدەم هاوڕێ کەت بڕوات و ڕزگاری دەکەم، پێم بدە، ئەی ئەگەر نەتدەمێ؟ دێوەکە وتی: ئاخر جادوویەک لە تۆ دەکەم و وونت دەکەم! منیش چوومە بەردەم ئەو قەفەزەی کە ئۆنای تێدا بەند کردبوو و شانەکەم هاویشتە سەر قەفەزەکە کە کۆرا چاوەڕێ بوو



تاکو بیگێڕێتەوە، بە دێوەکەم ووت: نا .. تۆ وانەکەی! دێوەکە گۆچانە سیحراوییەکەی ڕوو کردە من بەڵام من خۆم لەبەردەم جادووەکە لابرد و لە جیاتی ئەوەی من وون بکات قەفەزەکەی ئوونای وون کرد، ئوونا ئازاد بوو بەڵام دێوەکە زۆر تووڕە بوو ئاراستەی گۆچانە سیحراویەکەی ڕووکردە ئێمە، ئاگاداری کردینەوە، ئێوە ناتوانن جارێکی تر فێڵ لە من بکەن، لەناکاو فارلی فڕیە سەر دێوەکەو کلۆڤەری هەڵدایە سەر سەری دێوەکەو کردی بە گۆچانە سیحراویەکەی دێوەکەدا و بردی، کۆرا شانەکەی گرت و دەستی کرد بە درەو شانەوە، کۆرا هاواری کرد، بەرزبوونەوەی ئاو لە ژێر فەرمانی منداپە، دواتر ئاوێکی پێچ خواردووە تەقیەوەو دێوەکەی دەریای لە کەنداوۆکە دەرهێنا، هەمووەمان بە پەلە گەڕاینەوە بۆ لای شازادە ئیمەلاین ووتی: سوپاس بۆ خوا کە تۆ سەلامەتی! دەستەکانی بەرز کردەوە تاکو زریانەکە بوەستێنێت، ئێستا خانەوادەکەی منیش سەلامەت دەبن. من و خانەوادەکەی ئوونا گەڕاینەوە بۆلای کەشتی سەر ئاو کەوتووەکە، نەمان دەتوانی چاوەڕێی ئەوە بکەین کە دوو خانەوادەکەمان چاویان بەیەک دەکەوێت! باوکم دانی بەوەدا نا کە هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کە پەری دەریای ڕاستەقینە هەبن بەڵام ئێستا دەزانێ، لەگەڵ ئوونا دانیشتم و تەماشای خۆرمان دەکرد، ئەو پەری دەریاو منیش مرۆڤ بەڵام دەزانم کە دەبین بە هاوڕێی هەمیشەیی یەکتر.



# سۆفیا و جەژنی جادوو

من شـازادە سۆفیام، زۆر پڕ جۆشم! ئەمڕۆ ئێمە یاری کرۆکێت دەکەین و چاوەڕێی جەژنی جادووین تـا دەست پێبکات بەیڵی ویک یاریەکەی ئێمەی وەستان تـاکو میوانێکی چاوەڕوان نەکراو بە ئێمە بناسێنێت، بەیڵی ویک ساشای جادووگەری پێ ناساندین، ئەو جا دووگەرە ووتی: من هاتووم تـاکو ڕێزی خۆم پێش کەشی پاشا ڕۆلاندی مەزن بکەم، بۆیە گۆچانێکی جوان و ڕازاوەی بۆ باوکم و هەندێک گوڵ بۆ دایکم و بـازنەیەکی زۆر جوان بۆ ئامبەرو پوتێکی درەوشاوەی بە جەیمس پێشکەش کرد. شتێک سەبارەت بە ساشا وا دەردەکەوت ناسراو و ئاشنا بێت بۆیە لێم پرسی: ئایا پێشتر یەکترمان بینیوە؟ بەووردی تەماشای گەوهەرەکەی ملی کردم و ووتی: نـا، من شازادەیەکی جوانی وەک تۆم بیر نایەتەوە بە تـایبەت کە گەوهەرێکی وا جوانی لە ملدابێت، دواتر ساشا ملوانکەیەکی بۆ منیش دروست کرد، بەڵام هەرگیز ئەو گەوهەرەی ملم داناکەنم بۆیە ملوانکەکەی خۆمم دا بە ئامبەری خوشکم، دواتر سیدرک هات و خۆی ناساند ووتی: من



سیدركی جادووگەرم، ساشا وەڵامی دایەوە: شانازییە. دایكم و باوكم ساشا یان بانگهێشت كرد بۆ جەژنی جادوو، هەموومان زۆر بە جۆش بووین سەبارەت بە ساشا بەڵام شتێكم سەبارەت بە ساشا پێ ڕاست نەبوو، بۆیە چووم بۆ لای سیدرك و پێم ووت: هەستێكی خراپم هەیە سەبارەت بە ساشا، لەگەڵ ئەوەی تۆش جادووگەری من پێم وایە تۆ باشتر بزانی، بەڵام سیدرك پێی ووتم: نیگەران مەبە سەبارەت بە ساشا ئەو پێی وابوو كە كەسێكی باشە، دواتر سیدرك ئامادەكاریەكانی خۆی بۆ جەژنەكە پێ نیشان دام، بە جوڵەی گۆچانە سیحراویەكەی دەستی چووینە ژوورەوە كە ئاوێنەی تێدابوو بەڵام هیچ ئاوێنەیەكی لێ نەبوو هاوشێوەی ئاوێنە بوون، واو! بە تەواوی جیاواز دەردەكەوتم لەهەر یەكێكیاندا. لە كۆتاییدا جەژنی جادوو دەستی پێكرد، میوان لە هەموو شوێنێكی شانشینەكەوە هاتبوون، سیدرك ئامادە باشی دەكرد بۆ دەرخستنی فێڵەكانی، گۆچانە سیحراویەكەی دەستی بەرزكردەوە، هاوشێوەی ئاوێنەكان دەركەوتن بەڵام كارەكان هەڵە تێپەڕین، ئاوێنەكان تەڵەیان بۆ سیدرك دانابوو، سیدركیان وەكو تۆپێك لێكردبوو



لە ئاوێنەیەکەوە دەیان کێشا بە ئاوێنەیەکی تردا، کەس نەیدەزانی چی بکات جگەلە ساشا، تەنها بەیەک جوڵەی گۆچانە سیحراویەکەی دەستی وایکرد ئاوێنەکان وون ببن. ساشا بە جادووەکەی جوانترین و بە تامترین خوانی ڕازاندەوە بۆ جەژنی جادوو، هەموان سەرسام بوون بە جادووەکەی ساشا جگەلە سیدرک کەبە خەمباریەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە، بەدوای ڕامکردو بانگم کرد، بەڕێز سیدرک چاوەڕێکە! بەڵام سیدرک لەبەر چاوان وون بوو، سیدرکی داماو، من زۆر خەمبارم بۆ سیدرک، کلۆڤەر هات بۆ لام و پرسی: چی ڕوویداوە؟ پێم ووت: هەمووان پێیان وایە جادووەکانی جادووگەرە نوێیەکە زۆر باشترن لەوانەی سیدرک، بەڵام شتێکی هەڵە هەیە سەبارەت بە ساشا، وام ووت و گەوهەرەکەی ملم دەستی کرد بە درەوشانەوە و کچەی بەفر کە دەنکە هەنارەیشی پێدەڵێن دەرکەوت، لەلام دانیشت و دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆک بۆ من، جارێکیان ژنێکی بەتەمەن سێوێکی ژەهراوی پێدام بەڵام لە ڕاستیدا ئەو زڕ دایکەکەم بوو کە خۆی لێم گۆڕی بووم، دەنکە هەنارە دەستی گرتم ووتی: سۆفیا خەڵکی هەمیشە ئەو کەسە نابێت کە ئاواتی پێ دەخوازی، ئەگەر هەستێکی خراپت سەبارەت بە شتێک هەبێت ئەوا پێویستە بڕوا بە و هەستەت بکەیت، ئێستا زانیم چی بکەم دەبێ دایکم و باوکم



ئاگاداربکەمەوە سەبارەت بە ساشا بەڵام کاتێک ویستم بچم بۆ ژووری دانیشتنەکە ساشا لە دەرەوە وەستا بوو، دەرگاکەی لە ڕێگەی دار مێوەوە داخستبوو لەناکاو ڕووخساری گۆڕا، ئێستا زانیم بۆچی ئەو زۆر ناسراو دەردەکەوێت، هاوارم کرد: خاتوو نێتڵ، خاتوو نێتڵ ئەفسانەیەکی زۆر خراپ بوو، جارێکیان هەوڵی دا کتێبێکی جادوو لە ئەفسانەیەکی باش بدزێت بەڵام من وەستاندم، لیم پرسی: تۆ چی دەکەی لێرە؟ وەڵامی دایەوەو وتی: من هاتووم بۆ گەوهەرەکەی تۆ، ویستی بمگرێت بەڵام من لە دەستی ڕامکرد، بردم بۆ هۆڵە گەورەکەو لەوێ سیدرکم بینی کە پرۆڤەی دەکرد لەسەر فێڵی ئاوێنەکان، خۆش بەختانە ئەم جارە بە تەواوی کاری دەکرد، خاتوو نێتڵ ئێمەی لەوێ دۆزیەوە ووتم: تۆ گەوهەرە سیحراویەکەی منت دەوێت؟ وەرە لێمی ببە، خاتوو نێتڵ دارە جادوویەکەی ڕووکردە من پێی وابوو کە منم، بەڵام من نەبووم وێنەی من بوو لە ئاوێنەکەدا بۆیە جادووەکە گەڕایەوە بۆ خۆی و کەوتە تەڵەی جادووی خۆیەوە بەڵام خاتوو نێتڵ توانی خۆی لە تەڵەکە ڕزگار بکات و لە پەنجەرەکەوە هەڵهات و ووتی: دوا شتی منت هێشتا نەبینیوە دەگەڕێمەوە بۆت»، ئۆخەی ئێستا ئەو ڕۆشت هەمووومان دەتوانین چێژو خۆشی لە فێڵەکانی سیدرک ببینین ، هیوادارم خاتوو نێتڵ نەگەڕێتەوە بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە ئەوا من ئامادەم بەرەنگاری ببمەوە، سوپاس بۆ ئامۆژگاریەکانی هاوڕێ نوێیەکەم دەنکە هەنارە.



# سۆفیا و ڕۆژی پشوو

من سۆفیام، ئەمە یەکەم پشووی (وەسەیلیا)مە لە کۆشک، نامەوێت تەنانەت یەک چرکەشم لە دەست بچێت، هەمیشە وا ڕاهاتبووم وەسەیلیایەکەی هێمن و ئارام لەگەڵ دایکمدا بەسەر ببەم، بەڵام ئامبەرو جەیمس ئەڵێن وەسەیلیا لە کۆشک تەواو جیاوازە، تەنێک خواردن دادەنرێت و دارچناری گەورەو مۆمی دڵڕفێن و ژمارەیەکی ئێجگار دیاری، بە ئامبەرم ووت: وەسەیلیات بە خۆشی ئامبەر، ئەو کاتە خۆش دەبێت ئەگەر ئەو ئاژەڵە ئەفسانەییە یەک قۆچەکەم دەست کەوێت کە داوای دەکەم، هەر لە و کاتەدا دایکم هات، جەیمس پرسیاری لێکرد: کوا باوکم؟ دایکم ووتی: بە هۆی هەندێک کاروباری شاهانەی بەپەلەوە لەگەڵ بەیلی ویک چووەتە دەرێ، لەکاتی خۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئاهەنگەکە، ئەو ماوەیەی کە چاوەڕێی هاتنەوەی باوکم دەکرد چووم بۆ سەردانی ئەسپەکان و بە تایبەت (مینی مەس) کە خۆشەویسترین ئەسپی باڵدارە لەلام، بەڵام کاتێک گەیشتمە خانەی ئەسپەکان بینیم هەموو ئەسپەکان سەرمایان بووەو نەخۆشن بەڵام (مینی مەس) ساغ و تەندروست بوو، پێی ووتم: هەرچەندە ئەسپەکانی تر نەخۆش بن بەڵام دڵ خۆش دەبم ئەم پشووە لەگەڵ تۆ بەسەر ببەم. لەوکاتەدا جارێکی تر بەفربارین دەستی پێکردەوە گەڕامەوە بۆ کۆشک بەڵام



هێشتا باوکم نەگەڕابووەوە بۆ ماڵ پرسیم: نەدەبوو ئێستا باوکم بگەڕایەتەوە؟ ئامبەر سەرێکی لەقاند و ووتی: ئێستا کاتی ئاهەنگەکەیە، دایکم داوای لە کەنستبڵ مایلس کرد تاکو بە دوای باوکمدا بگەڕێت، ووتم: منیش دەمەوێت بڕۆم و بە دوای باوکمدا بگەڕێم، لەولاوە جەیمس ووتی: ئەگەر سۆفیا بچێت ئەوا منیش دەچم، دایکیشم ووتی: ئەی بۆچی هەمووومان نەڕۆین؟ بە گالیسکە فڕیوەکە دەڕۆین، مینی مەس تەنها ئەسپی باڵدار بوو کە تەندروست بێت و بتوانێ گالیسکەکە ڕابکێشێ، لە مینی مەسم پرسی: دەتوانی ئەوە بکەیت؟ مینی مەس منگاندی زۆر دڵنیا نیم سەبارەت بەوە، هەر کە گالیسکەکە دەستی کرد بە فڕین کلۆڤەر و ڕۆبن ومیام بینی لە پشتی گالیسکەکەوە، پێم وابێ ئەوانیش دەیانەوێت کە یارمەتیمان بدەن بۆ دۆزینەوەی باوکم، کاتێک گالیسکەکە بەسەر شەقامەکاندا دەفڕی تەماشای خوارەوەم کرد و ئەسپەکانی شاهانەم بینی بەڵام هیچ گالیسکەیەکیان بە دواوە نەبوو. زریانەکە تا دێت بە هێزتر دەبێت، پێویستە بگەڕێینەوە، کەنستبڵ مایلس وای ووت: بەڵام من سەرم لەقاند و ووتم: ناتوانین بگەڕێینەوە هەتا باوکم نەدۆزینەوە، دواتر دارستانەکە بەهۆی باهۆزی بەفرەکەوە دیار نەما، مینی مەس داماو زۆر ترسا بەڵام توانی گالیسکەکەی بە سەلامەتی بنیشێنێتەوە، کەنستبڵ مایلس دەیویست هەموو کەسێک لە ناو گالیسکەکەدا بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی زریانەکە کۆتایی پێدێت، بەڵام دایکم دەیزانی کە



چەندە نیگەرانی مینی مەسم بۆیە ڕێی پێدام کە لە گالیسکەکە دابەزم و لە مینی مەس دڵنیا بم، پێم ووت: مینی مەس ئێمە بە تەماین چی بکەین، دەبێ باوکم بدۆزینەوە، کتوپڕ گەوهەرەکەی ملم دەستی کرد بە درەو شانەوە و شازادە ئەورۆرا دەرکەوت، هاوارم کرد: شازادە ئەورۆرا! تۆ هاتوویت تا یارمەتی ئێمە بدەیت؟ ئاورۆرا وەڵامی دایەوە: پێویستت بە یارمەتی من نیە، من هەمیشە پشت بە هاوڕێ ئاژەڵەکانم دەبەستم لە کاتە سەختەکاندا، تۆش دەتوانی ئەوە بکەیت، کاتێک کلۆڤەرو رۆبن و میام بینی بیرم کردەوە ڕەنگە ئەورۆرا ڕاست بکات ڕەنگە هاوڕێ ئاژەڵەکانم بتوانن یارمەتیم بدەن بۆیە داوام لێکردن کە داوا لە بوونەوەرەکانی دارستان بکەن تاکو یارمەتیمان بدەن و بە دوای پاشا ڕۆلاندا بگەڕێن، زۆر بە خێرایی پەیامەکە بە سەراپای دارستانەکەدا بڵاوبوویەوە هەموویان ووتیان پێویستە پاشا بدۆزینەوە! دواتر پاشایان بینی، زۆری پێنەچوو ڕۆبن و میا بە هەواڵێکی خۆشەوە گەڕانەوەو وتی: دۆزیمانەوە! ئامبەر شڵەژاو ووتی: باڵندەکان چی دەکەن لێرە؟ ئۆ من دەمتوانی لێیان تێبگەم کەچی دەڵێن بەڵام ئەوانی تر تەنها گوێیان لە ئاوازەکانیان بوو، بۆیە پێویست بوو زۆر بە خێرایی بیربکەمەوە، خۆش بەختانە هەموویان ڕازی بوون کە دوای ئاژەڵەکان بکەون بۆ ناو دارستانەکە، مینی مەس گالیسکەکەی ڕاکێشا بەناو بەفرەکەدا تا گەیشتین بە خانوویەکەی بچووکی تەختە، لە دەرگاکەمان دا تۆ بڵێی کێ



له ژوورەوه بێت ... هاوارم کرد باوکە! باوکم پرسیاری لێکردین: چۆن منتان دۆزیەوە؟ ووتم ئەوە موعجیزەی واسەیلیە! باوەشێکی توندمان پێدا کرد و لێمان پرسی: بەڵام چی تۆی هێنایە ئێرە؟ باوکم دانی بەوەدا نا کە کاروباره شاهانەییە بەپەلەکە ئەوە بووە کە ویستوویەتی بچێت بۆ شارۆچکەکە تاکو خەڵات و دیاریان بۆ بکڕێت بەڵام لە گەڕانەوەیدا بەفرێکی زۆر باری وەو گالیسکەکەی لە بەفردا چەقیوە. بایکی ویک ووتی: خۆش بەختانە پیاوێکی دارستانی میهرەبان ئێمەی دۆزیـەوەو بانگهێشتی کردین بۆ ماڵی خۆی تاکو لەگەڵ خانەوادەکەیدا بین تاکو ڕێگاکە دەکرێتەوە، باوکم ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، ئەوە پشووە کە لەگەڵ ئێوەدا کات بەسەر ببەم ئازیزان و خۆشەویستان، من تەماشای هەموو ئەو دیاریانەم کرد کە باوکم بۆی هێنا بووین، دیاریەکەی خۆمم دا بە مناڵەکانی پیاوی دارستانەکە پێم ووتن: واسەیلیتان بە خۆشی! دواتر یارمەتی دایک و باوکمم دا تاکو مۆمی واسەیلی دابگیرسێنین، ئێ.. یەکەم پشووی واسەیلی مان لەگەڵ خانەوادەکەمدا بەو شێوەیە نەبوو کە پێشبینیم کردبوو بەڵام پێکەوە بەسەرمان برد ئەمەش وایکرد کە خۆش ترین پشوو بێت.



# سۆفیا کتێبخانە نهێنیەکە

هەر لەو کاتەوەی سۆفیا بووە بە شازادە ژیانی پڕبووە لە سەرکێشی، ئەمڕۆ سۆفیا و ئامبەر و جەیمس پێشبڕکێ یان دەکرد، سۆفیا و ئەسپەکەی مینی مەس خەریک بوو بیبەنەوە لەو کاتەدا ئەسپێکی باڵدار ڕێگاکەی لێ داخستن، سۆفیا هاواری کرد، پوورە تیلی: سۆفیا ئەو کاتانەی زۆر لا خۆش بوو کە ئەو دەهات بۆ سەردانی کردنیان، کە گەڕانەوە کۆشک تیلی لە سۆفیای پرسی سەبارەت ئەو کتێبەی خوێندویەتیەوە کە داویێتی پێی سۆفیا ووتی: هێشتا لە بەشی دوانزەیەمدام، کاتێک سۆفیا گەیشتە ژوورەکەی کتێبەکەی خستە سەر بەشی دوانزەیەم بینی کتێبێکی بچووکتر لەو پەڕەیەدا شاردراوەتەوە، کەباسی سەرجەم ڕێڕەوە نهێنیەکانی ناو کۆشکی ئینچانسیا دەکات لە ناکاو گەوهەرەکەی سۆفیا بە ڕەنگێکی شین درەوشایەوە، کە ڕابەرایەتی دەکرد بۆ دیوارێک کە یەکێک لە ڕێڕەوەکانی دەدۆزیەوە. سۆفیا شوێنی ڕووناکی گەوهەرەکەی ملی کەوت بەکراوەیەکدا ڕۆشت بەرەو ڕێڕەوێک لە ژێر کۆشکەکەدا، لە کۆتایدا گەیشت



بە جۆگەلەیەک لە ژێر زەویەکەدا کە بەلەمێک چاوەڕێی دەکرد، بەلەمەکە سۆفیای برد بەرەو ڕێگایەکی پلەپلە دار لەوێوە بەرەو دوو دەرگای قوفڵ کراو، قوفڵەکە لە شێوەی کتێبەکەی دەستیدا بوو، لە خۆی پرسی: تۆ بڵێی کتێبەکە کلیلەکە بێت؟ سۆفیا کتێبەکەی لە شوێنی قوفڵەکە داناو ئیشی کرد و دەرگا داخراوەکە کرایەوە سۆفیا بە سەرسامیەوە پرسیاری کرد: واو من لە کوێم؟ دەنگێکی ناسراو وەڵامی دایەوە، لە کتێبخانەی نهێنی، کە بینی پوورە تیلی لێ بوو! ئەو ووتی: کتێبخانەکە پڕبووە لە چیرۆکی ژیانی ڕاستەقینە کە پێویستی بە کۆتاییە بە سۆفیای وت کە ئەو چیرۆکەکان دەپارێزێت وە هەروەها ووتی: ئەرکی پارێزەری چیرۆکەکانە کە یارمەتی بدات بۆ تەواو کردنی چیرۆکەکان وە ئێستا هیوا دەخوازم کە ئەم کارە ببێت بە ئەرکی تۆ، سۆفیا لێی پرسی: دەتەوێت ببم بە پارێزەری چیرۆکەکان؟ پوورە تیلی سەرێکی لەقاند، لێرەوە یەکەم چیرۆکی تۆ دەست پێدەکات، کتێبێکی جادوویی لەسەر ڕەفەکانەوە فڕی کە ناوی: بەسەرهاتی دۆڵی وایڵد وینگ بوو، چیرۆکی ئەسپێکی باڵدار بوو کە ناوی مازیمۆ یە کەلە خانێکی شاهانەدا ژیاوە بەڵام دواتر بووە بە کێوی، ئەو خانەی خۆی بەجێ هێشتوە بەمەستی گەڕان بە دوای شوێنێکدا کە ناوی دۆڵی وایڵد وینگە کە لە وێ



ژوور بۆ ئاژەڵە سەرنج ڕاکێشەکان بە خۆڕاییە بەڵام مازیمۆ لەلایەن میر ڕۆدریکەوە دەست بەسەر دەکرێت و دەیبات بۆ کۆشکەکەی خۆی لە بۆریا، سۆفیا ووتی: ئەوە زۆر ناخۆشە، پوورە تیلیش پێی وایە کە زۆر ناخۆشە تا ئەو کاتەی کە تۆ کۆتاییەکی باشتر دەبەخشی بە چیرۆکەکە، بەڵام سۆفیا زۆر دڵنیا نەبوو لەوەی کە ئەتوانێ ئەوە بکات بۆیە پوورە تیلی ڕازی بەوەی کە یارمەتی بدات تەنها ئەم جارە. زۆر بە خێرایی بەرەو خانی ئەسپەکان ڕۆشتن کاتێک سۆفیا قسەی لەگەڵ مینی مەس کرد سەبارەت بە ئەرکەکانیان، مینی مەس زۆر بەلایەوە خۆش بوو ووتی: مازیمۆ برایەتی زۆر لە مێژە وونبووە! ئەوان فڕین بۆ بۆریا و زۆری پێ نەچوو خانە شاهانەکەیان دۆزیەوە، زۆر گەورەبوو هەموو شتەکانی لە ئاڵتوون دروست کرابوون سۆفیا بە پوورە تیلی وت: مازیمۆ بە دڵنیاییەوە لێرەیە لە شوێنێکە، بۆیە بڕیاریاندا دەست بکەن بە گەڕان بە خانەکەدا. سۆفیاو مینی مەس مازیمۆ یان لە کۆشکێکی داخراودا دۆزیەوە، مازیمۆ ووتی: زۆر باش بوو تۆم لێرە بینی براکەم، دەتوانی تۆ ئێستا لێرە من ببەیتە دەرەوە؟ مینی مەس تەماشایەکی دەوروبەری کرد تۆزێک شڵەژا ووتی: بەڵام ئێرە جوانترین خانەیە کە تا ئێستا بینیبێتم بۆچی دەتەوێت ئێرە بە جێ بهێڵیت؟ مازیمۆ ووتی: بەڵێ زۆر جوانە بەڵام قەفەز هەر قەفەزە ئەگەر هەر چیەک بێت، سۆفیا ووتی: دواتر با لێرە بچینە



دەرەوە با قسە بکەین، بەڵام کات زۆر درەنگ بوو میر ڕۆدریک لەو کاتەدا گەیشتە خانەکە لەگەڵ ڕاهێنەری خانەکە، ڕۆدریک لە سەرەتادا زۆر هاوڕێیانە دەردەکەوت تا ئەو کاتەی سۆفیا بۆی ڕوون کردەوە کە ئەوان بۆیە لەوێن تا مازیمۆ ڕزگار بکەن، میر ڕۆدریک ئاماژەیەکی بۆ مازیمۆ کرد و ووتی: مەبەستت سەندە کلاودە؟ ئەو ئێستا ئەسپی منە، مازیمۆ منگاندی، دەتوانی بڕوا بوە بکە کە ئەو ئەو ناوەی لێناوم؟ ڕۆدریک ووتی: سەندە کلاو با بچین بۆ سواربوون. دواتر سۆفیا بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات کاتێک ڕۆدریک دەرگای کۆشکەکەی کردەوە، سۆفیا گوریسەکەی گرت و هاواری کرد، بفڕە مازیمۆ! مازیمۆ بە خێرایی لە کۆشکەکە دەرچوو دەستی کرد بە فڕین، ئەوان سەرکەوتوو بوون مازیمۆ یان ئازاد کرد دواتر گوێیان لە هاوارێک بوو لە پیشتیانەوە کە ئاوڕیان دایەوە بینیان ڕۆدریک و ڕاهێنەری خانەکەن بە دوایانەوەن مازیمۆ ووتی: وایڵد وینگ لە پێشمانەوەیە، سۆفیا هاواری کرد، با وونیان بکەین لە دۆڵەکەدا، ئەوان بە خێراییەکی زۆر بە ناو دۆڵە تەسک و پێچ خواردووەکەدا ڕۆیشتن دواجار توانیان ڕۆدریک لە چاو وون بکەن بەڵام مینی مەس زۆر تووڕە بوو لە براکەی پێی ووت: دۆزینەوەی ئەم دۆڵە هەموو ئەو شتە بوو کە تۆ گرنگیت پێدەدا؟ ئەو کاتەی تۆ ڕۆشتیت تەنها خانەکەت بە جێ نەهێشت بەڵکو دایک و باوک و منیشت بە جێ هێشت!



**مینی مەس هێندە تووڕە بوو کە نەیتوانی تێبینی دارێک بکات کەلە پێشیەوە بوو سۆفیا هاواری کرد، ئاگاداربە! مینی مەس ڕاستەو ڕاست بەرەو سەرەوە ڕۆشت بۆ ئەوەی خۆی لە دارەکە لابدات بە جۆرێک سۆفیا نەیتوانی خۆی بگرێت و لەسەر پشتی مینی مەس کەوتە خوارێ، پوورە تیلی جادوویەکی بەکارهێنا بۆ گرتنەوەی و ووتی: کۆناجا، بەڵام جانتا سیحراویەکەی پورە تیلی کەوتە خوارەوە کە نیشتەوە تەماشای سەرەوەیان کرد تا ببینن کە ڕۆدریک بە دوایانەوەیە ئایا مینی مەس یان مازیمۆی دەست گیرکردووە؟ سۆفیا و پووری لە هەموو کات زیاتر پێویستیان بە جانتا سیحراویەکە بوو بۆیە بوون بە دوو بەشەوە تاکو بیدۆزنەوە سۆفیا سەروو خوار گەڕا بەڵام بە بێ بوونی هیچ بەختێک لە دۆزینەوە، وای هەست دەکرد کە ئەو پارێزەرێکی باشی چیرۆکەکان نەبووە، ئەو مینی مەس و مازیمۆی وون کرد، ڕەنگە کەسێکی گونجاویش نەبێت بۆ ئەو کارە، سۆفیا تێبینی کرد کە گەوهەرەکەی ملی دەدرەوشێتەوە دواتر تیرێک بەر دارەکەی تەنیشتی کەوت!. سۆفیا ئاوڕی دایەوە درەوشاوەیەکە شازادە میریدای بینی گەوهەرەکەی سۆفیا ئەوی هێنا بوو تا یارمەتی بدات، کاتێک میریدا گوێی لە چیرۆکی سۆفیا بوو زەردەخەنەیەکی کرد و ووتی: هەموو ئەوەی کە ئێوە پێویستتانە ئەوەیە کە ئەو بڕوایەتان هەبێ کە خۆتان**



دەتوانن بیان پارێزن، ئەگەر بڕوات بە خۆت بێت بڕوات بەوە بێت کە دەیکەیت ئەوا تۆ هەمیشە ڕاست دەبیت، هەر کە سۆفیا گەڕایەوە بۆ دارستانەکە ئەسپەکەی پوورە تیلی بینی و بازیدا، زۆری پێنەچوو مینی مەس و مازیمۆ بینی کە بەسترابوون بە ئەسپەکەی ڕۆدریکەوە سۆفیا خۆی هەڵدایە سەر پشتی مینی مەس و گوریسەکەی کردەوە ڕۆدریک بینی، هەموو ئەوەی کە سۆفیا لە بەردەستیدا بوو چەترەکەی تیلی بوو بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات بە دەوری ڕۆدریکدا سوڕایەوە و چەترەکەی گیر کرد لە پشتوێنەکەی ڕۆدریک و هەڵی دا یە خوارەوە، دواتر مازیمۆی کردەوەو لە کۆتاییدا ئازاد بوو، مازیمۆ ڕێگای گرتەبەر بەرەو خاکی خەونەکانی دۆڵی وایڵد وینگ زۆر جوان بوو، مینی مەس ڕووی کردە براکەی و ووتی: دوای ئەوەی کە تۆ دەست بەسەر کرایت لەلایەن ڕۆدریکەوە لە کۆتایدا تێگەیشتم کە هەست چۆنە، مازیمۆ ووتی: ڕەنگە ئێمە جیاواز بین بەڵام تۆ برای منی وە من تۆم خۆش دەوێت، مینی مەس پێکەنی و ووتی: منیش تۆم خۆش دەوێت، کاتێک گەڕانەوە بۆ کتێبخانە نهێنی یەکە پوورە تیلی سوپاسی سۆفیای کرد بۆ کۆتایی هێنان بەو چیرۆکە سۆفیا پرسیاری کرد، چی تر دوای ئەوە؟ پوورە تیلی زەردەخەنەیکی کرد و ووتی: دانیشەو چیرۆکێک بدۆزەرەوە، پارێزەری چیرۆک!.




# دۆرا و پۆپی توتکە سەگ

دۆرا گەورە بوو بوو لە شاری نوێرک لە ئەمریکا دەیخوێند، چەند هاوڕێیەکی هەبوو زۆری خۆش دەویستن، هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانیدا خەریکی کاری باش بوون، ڕۆژێکیان دۆراو هاوڕێکانی بە یەکێک لە پارکەکانی شاردا پیاسەیان دەکرد، بینیان لەبن درەختێکەوە گیانلەبەرێک دەرچوو، دۆراو هاوڕێکانی هەمویان ترسان، کتێک بینیان توتکە سەگێکی جوان و خوێنشیرین سەیریان دەکات، دۆراو هاوڕێکانی توتکەسەگەکەیان هەڵگرت و لێیان پرسی: توتکە سەگی جوان کێشەت



چییه؟ بۆچی لەم پارکەدا بەتەنهایت؟ توتکە سەگ دەستی کرد بە عووووو عووو عووو، دۆراو هاوڕێکانی لێی تێگەیشتن کە توتکەکە برسیەتی، بۆیە بڕیاریاندا بیبەن خواردنی بۆ بکڕن، یەکێک لە هاوڕێکانی دۆرا وتی: چی لەم توتکە سەگە بکەین باشە؟ ئادەی با هەرکەسەو لە لای خۆیەوە پێشنیاری خۆی بکات، دۆرا وتی پێش هەموو شتێک دەبێت بیبەین بۆلای پزیشکی گیان لەبەران بۆ دڵنیابوون لە تەندروستی، یەکێک لە کچە هاوڕێکانی دۆرا پێشنیاری کرد بیبەن بۆ خانەی بەخێوکردن و چاودێری کردنی گیان لەبەران، چونکە سەگەکە هیچ خاوەنێکی نەبوو، دیگۆی کوڕە هاوڕێیان پێشنیاری کرد کە ناوێکی جوانی لێبنێن و چیدی توتکەکە بێناو نەمێنێتەوە، هاوڕێیەکی تری دۆرا پێشنیاری کرد کە بیشۆن بۆ ئەوەی ئەو چڵکە زۆرەی لێبکەنەوە کە پێوەیەتی، بۆیە تێکڕا دۆراو هاوڕێکانی دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی پلانەکانیان، سەرەتا توتکەکەیان برد بۆ لای پزیشکی گیان لەبەران و لە تەندروستی دڵنیا بونەوە، دواتر توتکەکەیان برد بۆ لای خانەی چاودێری کردنی گیانلەبرانی بێ سەرپەرشت، کاتێک دۆراو




هاوڕێکانی چونە ژورەوە بینیان، لەناو خانەکەدا چەندین گیانلەبەری زۆر جوانی لێیەو زۆر بەجوانی گرنگیان پێدەدرێت، توتکەسەگگەکە لەباوەشی دۆراوە خۆی هەڵدا بۆ ناو گیانلەبەران و کەوتە یاری کردن لەگەڵ بەرازەکان، کاتێک دۆراو هاوڕێکانی بەسەرهاتی توتکەکەیان بۆ خاتونی بەڕێوەبەری خانەکە باسکرد، بەڕێوەبەر زۆر بەخۆشحاڵیەوە داوەکەی جێبەجێکردن و توتکەکەیان لێوەرگرتن، کاتێک لە دۆرای پرسی توتکەکە ناوی چییە؟ دۆرا وەڵامی دایەوە کە هێشتا ناویان بۆ توتکەکە نەدۆزیوەتەوە، بۆیە بەکۆی دەنگ بڕیاریان دا توتکەکە ناوبنێن پۆپی، ئێوەش منداڵە جوانەکان کاتێک گیانلەبەرێک لەکۆڵان و پارک و ناوچە گشتیەکاندا دەبینن نابێت ئازاریان بدەن، دەبێت ڕێزیان لێبگرن و هاوکاریان بکەن.




# دۆرا و سوپاس

منداڵە خۆشەویستەکان ئێستا دەمەوێت ئاشناتان بکەم بە وشەی سپاس کە پێویستە هەمومان بیزانین، سوپاس ئەو وشەیەیە کە لەکاتی پێزانیندا بەرانبەر بەو کەسانەی کارێکی باشمان لەگەڵ دەکەن دەری دەبڕین، کاتێ کە مرۆمنداڵەکان خۆشەویست دەبن لبەرانبەر بە دایک و باوک و مامۆستا و خزم و کەسەکانیا بە هەڵسوکەوتی جوان و زمانێکی شیرین زیاتر زیاتر بەڕێزتر دەبن، ئەبیت بە پێزانین و لە خۆبوردەییەوە بژین بۆ ئوەی بەختەوەر و خۆشەویستبین، سپاس گوزاری بۆ مامۆستاکەت دەربڕە لەوکاتەی کە فێرت دەکات و وانەت پێدەڵێتەوە، من هەمیشە بەمامۆستاکانم دەڵێم

سپاس مامۆستاگیان بۆئەوەی هەمورۆژێک وەک دایک و باوکم فێری زانست و خوێندەواریم دەکەیت، سوپاسی دایک و باوکت بکە لەبەر ئەوەی هەمو تەمەنی خۆیان تەرخان کردووە بۆ بەخێوکردنی ئێمەو خوشک و براکانمان، دایک و باوک ئەو دوومرۆڤەن کە هەمیشە ئێمەیان خۆش دەوێت و پێمانەوە ماندوو دەبن, دایک و باوکمان هەمیشە هاوکاریمان دەکەن بۆئەوەی سەرکەوتوبین لەکارەکانمان، ئەوان ئەزمونیان لە ئێمی زیاترەو ڕێگا نیشاندەرمانن بۆیە دەبێت هەمیشە گوێڕایەڵیان بکەین سپاس گوزاریان بین. بیرت نەچێت سوپاسی ئەو کەسانە بکەن کەدیاریتان پێدەدەن، سپاسی ئەو کەسانەبکەن کە خۆشەویستی خۆیانتان بۆ دەردەبڕن.





# دیگۆ و دۆرا

دۆراو دیگۆ  دوو هاوڕێی یەک بوون زۆر هاوکاری یەکیان دەکرد زۆر یەکیان خۆش دەویست، هەمیشە ڕێزی یەکیان دەگرت دیێۆگۆ هەمیشە هاوکاری دۆرای دەکرد ئەوان بەردەوام یاریان بەیەکەوە دەکر، ڕۆژێکیان دیگۆ هاوڕێ باشەکەی دۆرا دایکی نەخۆش دەکەوێت، ڕۆژێک لە کافتریای قوتابخانەکە کاتێک دۆراو دیگۆ بەیەکەوە خواردنیان دەخوارد  بەدۆرای وت: ئایا دەتوانیت بەدایکت بڵێیت سوپێکی تایبەت بەنەخۆشی هەوکردنم بۆ ئامادەبکات؟ دۆرا و وتی چی بووە دیگۆ  سوپی نەخۆشیت بۆ چییە؟ پاشان دیگۆ  وەڵامی دایەوە و وتی: کە دایکی نەخۆشەو هاتووە کە دایکی ئەم سووپێکی تایبەتی نەخۆشی بۆ دروست بکات. دۆرا وتی: زۆر باشە بە دایکم ئەڵێم کە ئەو خواردنە تایبەتەت بۆ دروست بکات، کە دۆرا چووەوە ماڵەوە ئەمەی بەدایکی ووت: تانیا کە دایکییەتی وتی بۆچی دۆرا؟ دۆراش وەڵامی دایەوە  و وتی: دایکی



شیرینم لەبەر ئەوەی کە دایکی دیگۆی هاوڕێم نەخۆشەو داوای کردووە کە سووپێکی بۆ دروست بکەین. دایکی دۆرا وتی: باشە ئەوە دەکەم بەڵام پێویستیم بە یارمەتی تۆش دەبێت دۆرا، پێویستە تۆش یارمەتی من بدەیت لە دروستکردنی سووپەکەدا. دۆرا وتی: چیت پێویستە دایەگیان هەتا منیش بۆتی بکەم؟ چۆن یارمەتیت بدەم؟ دایکی وتی: ئەو شتانەم بۆ دەربێنە و ئامادەی بکە، دۆرا وتی: باشە دایە گیان وا دەکەم. دایکی وتی: تۆ چەند کچێکی شیرینیت و هەمیشە لە فەرمانی من دەرناچیت. دۆرا هەموو ئەو شتانەی کە دایکی پێی وتبوو ئامادەی بکات، ئامادەی کرد، بەڵام لەو کاتەدا دایکی لە نهۆمی سەرەوە بوو خەریکی دەرهێنانی جلەکانی ناو غەسالەکە بوو، پاش کەمێک دایکیشی هاتە خوارەوە بۆ ئەوەی کە دەست بکەن بە دروست کردنی سوپەکە لەگەڵ دۆرا، پاش ئەوەی کە دایکی دۆرا بە یارمەتی دۆرا پێکەوە سووپەکەیان دروست کرد، دایکی دۆرا داوای لە دۆرا کرد کە بچێت بۆ ماڵی دیگۆ و سوپەکە ببات بۆ دایکی دیگۆ بۆ ئەوەی کە چاک ببێتەوە لە نەخۆشییەکەی وە سوپەکەی بەشێوەیەکی جوان بۆ پێچایەوەو کردیە جانتاکەی کۆڵی دۆرا، دۆرا سوپەکەی ئامادە کرد و کەوتە ڕێ بەرەو ماڵی دیگۆ، هەرکە دۆرا چووە دەرەوە لە



ماڵەکەی خۆیان چاوی بە بووتسی هاوڕێی کەوت و داوای لێکرد کە لەگەڵیدا بێت بۆ ماڵی دیگۆ، بۆیە لێی پرسی و وتی: بووتس لەگەڵ من دێیت بۆ ماڵی دیگۆ، دایکی زۆر نەخۆشە و ئەبێ ئەم سووپەی بۆ ببەین؟ بوتس مەیمونێکی زۆر جوان و خنجیلەبوو کە هاوڕێیەکی هەمیشەیی دۆرابوو، هەمیشە هاوکاری دۆرای دەکرد و هەرگیز کاری خراپی بەرانبەر دۆرا نەدەکرد، بووتس وەڵامی دایەوەو وتی: دیگۆ کوڕێکی زۆر باشە بۆیە من حەز دەکەم یارمەتی بدەین، بۆیە ئامادەم و لەگەڵت دێم. لەم کاتەدا دۆرا لە بووتسی پرسی و وتی: ئایا تۆ ماڵی دیگۆ دەزانیت؟ ئەویش وتی: نەخێر بەباشی لەبیرم نەماوە ئێمە زۆر دەمێکە نەچوین. دۆرا وتی: منیش لەبیرم نەماوە، بۆیە پێویستە کە تەماشای نەخشە بکەین و ماڵی ئەوان بدۆزینەوە. ئەوە بوو کە هەردووکیان تەماشای نەخشەیان کرد و ماڵی دیگۆ یان لەسەر نەخشەکە دۆزییەوەو پاشان دیارییان کرد. بەڵام دەبوایە بەناو دارستانی



پڵنگەکەدا برۆشتنایە. چونکە تەنها ڕێگەیەک کە بیانگەیەنێتە ماڵی دیگۆ تەنها ئەو ڕێگەیە بوو. دواتر هەردووکیان بڕیاریان دا برۆن و بە دەم گۆرانی وتن بەرەو ماڵی دێیگۆ برۆن. ڕۆیشتن و ڕۆیشتن بەناو دارستان و سەوزایی و گوڵ و گوڵزاردا ڕۆشتن، ڕۆشتن هەتا گەشیتنە دارستانی پڵنگەکە, لەوێدا بۆ ماوەیەک ڕاوەستان، بووتس لە دۆرای پرسی کە چۆن بەناو دارستانەکەدا برۆن و پڵنگەکە تێپەڕێنن، لەو کاتەدا پڵنگەکە خەوتبوو بۆیە دۆرا وتی پێویستە کە ئێمە لەسەر نووکی پێمان برۆین بۆ ئەوەی کە دەنگی پێمان نەیەت، پڵنگەکەش لەخەو هەڵنەستێت. ئەوەبوو کە هەردووکیان بە سەلامەتی دارستانی پڵنگەکەیان تێپەڕاند. دۆرا بە بووتسی وت: کە پاش ئەم دارستانە ئەبێ بگەینە چەند پردێک کە لە نەخشەکەیاندا دیاری کرابوو, ئەوان هەر ڕۆشتن و ڕۆشتن تاوەکو بووتس بە دۆرای وت: ئێرە ئەو شوێنەیە کە تۆ باست لێوە کرد کە لەسەر نەخشەکەدایە. پاش ئەوە پردەکانیان تێپەڕاند و بە پێی نەخشەکە گەشتنە گردێکی بەرز، کە دەبوو ئەو گردەشیان تێپەڕاندایە بۆ ئەوەی کە بگەمە ماڵی دیگۆ، ئەمانیش بە هێواشی و لەسەر خۆیی و وردە وردە لەسەر گردەکە سەرکەوتن تاوەکو گەشتنە سەر بەرزترین شوێنی گردەکە و لەوێوە



به خۆ خلیسکاندن هاتنه خوارەوە و گردەکەیان تێپەڕاند. پاش ماوەیەک بووتس هاواری کرد، ئەوە ماڵی دیگۆ یە! ئەوە ماڵی دیگۆ یە! دۆراش پێی ووت: هێور بەرەوە بووتس، ئەوە بۆچی ئەوەندە دڵت خۆش بووە؟ دواتر چوون بەرەو ڕووی ماڵەکە و دایان لە درگایاندا، دیگۆ دەرگاکەی کردەوە و زۆر دڵخۆش بوو بە بینینی ئەوان، پاشان دۆرا پێی وت: کە ئەمە ئەو سووپەیە کە من و دایکم بۆ دایکی تۆمان دروست کرد. دواتر دیگۆ سوپەکەی لێ وەرگت و زۆر سووپاسی کردن. لە دوای ئەوە دۆرا و بووتس پێکەوە بە دەم گۆرانی وتنەوەو بە دڵێکی خۆشەوە بەرەو ماڵەوە کەوتنەوە رێ وتیان: تەواو کارەکەمان بە سەرکەوتووی ئەنجام داو هاوکاری هاوڕێکەمان کرد کە دایکی چاک ببێتەوە، بۆیە هاوڕێیان ئێوەش دەتوانن هاوکاری هاوڕێکانتان بکەن لەوکاتەی خۆیان یان دایکیان یان باوکیان یان هەر ئەندامێکی خێزانەکەیان نەخۆش کەوت لەبەر ئەوەی نەخۆشی تەنها بۆ هاوڕێکانمان و کەسوکارەکانیان نییە بەڵکو بۆ ئێمەش و کەسوکارەکانمانە ئەگەر ئێمە هاوکاری هاوڕێکانمان بین ئەوا ئەوانیش هاوکارمان دەبنەوە، ئەوکاتانەی کە پێویستیمان پێیان دەبێت بەدەمانەوە دێن و چاکەکەمان لەگەڵ دەکەنەوە.




# بەسەرهاتی شرێک

ژن و مێردێکی جوتیار دوای چەندین ساڵ چاوەڕوانی خودا کوڕێکی پێدان، ژن و پیاوە جوتیارەکە زۆر هەژار بوون، پارەی تەواویان نەبوو بۆ بەخێوکردنی منداڵەکەیان، پیاوە جوتیارەکە منداڵەکەی ناونا شرێک، لەبەر ئەوەی دایکی نەخۆش کەوت شیری نەما بیدات بە کوڕە نازدارەکەی، دایک و باوکی شرێک بەروبومی دار و درەختەکانیان دەدا بە شرێکی کوڕیان، جارێکیان بەروبومی دارێکیان بە هەڵە دا بە شرێک، شرێک ڕوخساری گۆڕاو لە مرۆڤێکی ئاساییەوە بوو بە مرۆڤێکی زۆر سەیر، هەتا زیاتر گەورە دەبوو قەبارەی لەش و دەموو ددان و گوێچکەکانی زیاتر گەورەو قەبح دەبوون، شرێک بۆخۆی کوڕێکی زۆر گوێڕایەڵ و باش بوو بەڵام خەڵکی گوندەکەیان زۆری لێدەترسان، بەنداڵی کاتێک گەورەبوو لەبەر گەورەیی ڕوخساری نەیان خستە بەرخوێندن، کاتێکیش گەورەبوو بوویەکەسێکی گۆشەگیر لەبەر ئەوەی کەس ئامادە نەبوو یاری لەگەڵ بکات، خەڵکی گوندەکە ئەوەندەیان بەباوکو دایکی شرێک وت: دەبێت کوڕەکەت دەربکەیت لەم گوندە هەتا دایک و باوکی شرێک لە خەفەت و مەینەتدا لەماوەیەی یەک مانگدا مردنو بۆهەتا هەتایە شرێکیان بەجێ هێشت، خەڵکی ئاوایی کاتێک زانیان دایک و باوکی شرێک مردووە، هەموویان کۆبونەوەو شرێکیان دەرکد لە ئاواییەکەیان، شرێک بەناچاری

پەنای بردە بەردارستان و لەوێ خانویەکی بۆخۆی دروستکردو تێدا دەژیا، بەتنهای بەردەوام بوو لەژیان لەناو دارستاندا هەتا بوو بە پیاوێکی زەبەلەحی بەهێزی گەورە، لە مەملەکەتەکەی شرێک پاشایەک هەبوو زۆر زۆردارو داگیرکەر بوو، پاشا لەگەڵ خەڵکەکەی باش نەبوو، ئەو هەمیشە جوتیارانی دە چەوسانەوو پارەو پوڵ و ماڵ و دانەوێڵەکەیانی لەڕێگەی پیاوەکانییەوە دەبرد بۆ خۆی، ڕۆژێک شرێک بیری دایک و باوکی دەکرد بۆیە نزیک بویەوە لە گوندەکەی خۆیان هەتا لەدورەوە سەیری ماڵەکەیان بکات کاتێک بەیەکەوە تێدا دەژیان، کاتێک نزیک بویەوە لەماڵی خۆیان بینی کە پیاوەکانی پاشا خەریکی ڕاوو ڕوتی خەڵکی گوندەکەیەتی و ئازاریان دەدات، شرێک خۆی پێ نەگیرا ئەوەی لەیادکرد کاتێک کە خەڵکی گوندەکەیان دەریان کردووە، بۆیە چوو بەفریای خەڵکی گوندەکەیان، هەر کە شرێک دەرکەوت پیاوەکانی پاشا ڕایان کردوو ئەو ناوەیان چۆڵ کرد، خەڵکی گوندەکەیان بەمەیان نەزانی کە شرێکی ڕۆڵەیەکی خۆیان پیاوەکانی پاشایان ترساندووە، بەڵام زۆر دڵخۆش بوون بەوەی پیاوەکانی پاشا ڕایانکرد، لەوکاتەدا گوێدرێژێک چوو بۆلای شرێک و زۆر سپاسی کرد کە لەوەی کە بەفریایەوە چووە ئەگەر ئەو نەبوایە دەیانبرد، گوێدرێژەکە ئاسایی نەبوو وەک مرۆڤ قسەی دەکرد، گوێدرێژەکە دوای لە شرێک کرد ببێت بەهاوڕێی بەڵام شرێک ئەوەی نەدەویست و پێی وت: لێی دورکەوێتەوە شرێک دەیوت من حەزم لەتەنیاییەو تۆش کەرێکی زۆر بلێیت، برۆ کەرە لێم دورکەوەرەوە. شرێک نەی دەویت کەس بێتە لای بژی چونکە وای هەست دەکرد کە قێزی لێدەکەنەوەو حەزیان بەسیمای نییە بۆیە بە گوێدرێژژەکەی وت: برۆ بۆلای کەسێکی تر من ناشیرینترین پیاوی ئەم جیهانەم. گوێدرێژەکە وتی: جوانی شەرت نییە تۆ کەسێکی زۆر باشیت من بینیم هاوکاری خەڵکت کرد منت لەدەست ئەو چەتانە ڕزگار کرد تکایە ڕێگام بدە با لەگەڵت بژیم، من گۆرانی دەزان چەندین چیرۆکم لەبەر، دەی تکایە ڕێگام بدە با لەگەڵت بژیم. شرێک ڕازی بوو کە گوێدرێژەکە لەگەڵی بژی، پاشماوەیەک بوون بە دوو هاوڕێی یەک، گوێدرێژەکە هەستی بەوە کردبوو کە شرێک چەندە باش و لەسەر خۆیە، ئەو دەیزانی لەبەر چی شرێک خۆی گۆشەگیر کردووە، شرێک و گوێدرێژ بەیەکەوە دەژیان، بوبونە دوو هاوڕێی گیانی گیانی یەکتری. ڕۆژێکیان دانیشتبوون نانیان دەخوارد لە خانوەکەی شرێک، لەپڕ گوێیان لەدەنگی گریانی کچێکی زۆر نازدار بوو، بەبێ وەستان شرێک چوو بەدەم گریانەکەوە بینی کچێکی زۆر جوان لەبن دارێک لەنزیک خانووەکەی شرێک دانیشتووە دەگری، شرێک چووە پێشەوە بۆلای پێی وت: پێویستیت بە هاوکاری هەیە؟



خانمە جوانەکە سەیرێکی شرێکی کردوو زەرد هەڵگەڕا لەترسا هیچی پێنەوترا، لەوکاتەدابوو کە پیاوەکانی پاشا هەڵیان کوتایە سەر خانمەکە شرێکیش دەستی کرد بە لێدانی پیاوەکانی پاشاو هەموویانی ڕاونا لەوناوە دوری خستنەوە، خانمە جوانەکە ترسەکەی لە شرێک ترساو شلەگەڵ شرێک چونەوە بۆ کوخەکەی شرێک، گوێدرێژەکە ناو ئاوی بۆ خانمەکە ئامادەکردوو لێی پرسی کچی جوان تۆ ناوت چییە؟ خانمەکە وەڵامی دایەوەو وتی: من ناوم فیۆنایە. شرێک بەبینینی ئەم خانمە جوانە قژ سورە زۆر هەستی بە خۆشحاڵی دەکردو پێی ئاسودەدەبوو، بەڵام زۆر شەرمی لێدەکرد، بەشەرمەوە وتی: پیاوەکانی پاشا بۆچی بەدوای تۆوە بوون؟ فیونا وتی: ئەوان دایک و باوک و براکەیان کوشتووە پاشا ویستویەتی بەزۆر بیکات بە ژنی خۆی، بۆیە منیش لەدەستی ڕام کردووە. شرێک تورەبوو وتی: دەبێت ئەو پاشایە ئاقڵ بکەم بۆ هەموو خەڵکی مەملەکەتەکەمان. کاتێک سەربازەکان بەسەرو ملی شکاوەوە چونەوە بەردەمی پاشا، پاشا وتی کوا فیۆنا؟ بۆ نەتان هێناوەتەوە لەگەڵ خۆتان؟ سەربازەکان هەموو شتێکیان بۆ پاشا گێڕایەوەو وتیان: زۆری نەمابوو دەست گیری بکەین دۆزیمانەوە بەڵام پیاوێکی زەبەلەح هات خەریک بوو هەمومان بکوژێت بۆیە لەدەستی ڕامان کرد. پاشا بەمە زۆر تورە بوو زۆر بیری فیوناى کردبوو، بۆیە فەرمانی بە سوپاکەی کرد کە بچن ئەو پیاوە زەبەلەحە بکوژن و فیۆنای بۆ بهێنن. فیونا بە شرێکی وت: دەترسم ببمە مایەی ناخۆشی بۆتان چونکە دڵنیام پاشا زاڵمەو وازناهێنێت ئەو سەربازانەی ڕۆشتنەوە ئەم شوێنە دەزانن و دێن بۆتان بەهۆی منیشەوە ئازاری ئێوەش دەدەن. شرێک وەڵامی دایەوەو وتی: هیچ خەمت نەبێت ئێمە بەباشی دەت پرێزین، دوای بەسەر بردنی



کاتێکی زۆر بە قسەکردنەوە شەو داهات لە سوچێکی ژورەکەی خۆیانەوە شوێنیشیان بۆ فیۆنا ئامادەکرد خەوتن، بۆ بەیانی لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی خۆردا سوپایەکی بەهێزو زۆر هاتن بۆیان چواردەوری کوخەکەی شرێکیاندا، شرێک زۆر بە ئازایانە ڕوبەڕویان بویەوە بەڵام لەبەر ئەوەی سوپاکە زۆر زۆر بوو بۆیە فیوناو گوێدرێژەکەو شرێک ڕایان کرد بۆ شوێنێکی نادیارو دورە دەستی ئەوان خۆیان لەدەست سوپاکە ڕزگار کرد. بە هەڵسوکەوتە لەسەر خۆیەکەی و بە هێمنی ڕەوشتە بەرزەکەی فیۆنا ڕۆژ بەڕۆژ شریکی لا خۆشەویست دەبوو ڕۆژێک فیۆنا لە شریکی پرسی: هۆکاری چییە تۆ ئا ئا ئاسایت و قەبارەت زۆر گەورەیە؟ شریکی وەڵامی دایەوەو هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ باسکرد پێی وت من بەهۆی خواردنی بەری دارێکەوە وام لێهاتووە، ئا ئا حەز بووم. فیۆنا وتی تۆ زۆر بەڕەوشتی زۆر هێمن و لەسەر خۆیت. زیاتر لە ساڵێک دەبوو بەیەکەوە دەژیان بۆیە ڕۆژێکیان فیۆنا بە گوێدرێژەکەدا جوابی بۆ شریک نارد بە گوێدرێژەکەی وتبوو من ئەمەوێت شوو بە شرێک بکەمو زۆر زۆرم خۆش دەوێت، کاتێک گوێدرێژەکە ئەمەی بە شرێک وت شرێک زۆر توڕەبوو چو بۆلای فیۆناو پێوت: نابێت هەرگیز بیر لەو بابەتە بکەیتەوە، فیۆنا زۆر نیگەران بوو بەو قسەیەی شرێکو وتی: من هەموو مەملەکەتەکە حەزدەکەن ببم بە ژنیان بۆچی تۆ ئەوە ڕەت دەکەیتەوە؟ شرێک وتی من زۆر ناحەز و ناشیرینم شایەنی ئەوەنیم کچێکی جوانی وەک تۆ هاوسەرم بێت تۆ پێویستە لەگەڵ کوڕێکی جوانی وەک خۆت هاوسەر گیری بکەیت. فیۆنا وتی من بەوە ڕازیم و حەزدەکەم تۆ هاوسەر گیریم لەگەڵ بکەیت، شرێک بە توڕەییەوە وتی: منیش حەز بەوە دەکەم بەڵام هەرکچێک شو بەمن بکات، ببێت بەهاوسەرم ئەوا وەک من ناشیرین



**دەبێت و ئەویش وەک منی لێدێت، ئەگەر تۆ ببیت بەهاوسەرم ئەوا وەک من ناشیرین دەبیت. فیێنا بەوەش ڕازی بوو، بۆیە وتی: من ئامادەم وەک تۆ ناشیرین ببم، بەڵام شرێک ئەوەندەی ئازار چەشتبوو بەدەست ناشیرینییەکەیەوە بۆیە حەزی نەدەکرد کەسی تر وەک ئەوی لێبێت بۆیە بەناچاری وتی، فیێنا تۆ کچێکی زۆر ناشیرینیت و من ئامادەنیم هاوسەر گیریت لەگەڵ بکەم. فیۆنا بەم قسەیە تورە بوو بۆیە بڕیاریدا بچێتەوە بۆ کۆشکی پاشاو شوو بەو بکات، ملی ڕێگای گرت بەرەو کۆشکی پاشا کاتێک لە پاسەوانەکانی کۆشک نزیک بویەوە سەربازەکان هاتن بەرەو ڕوی ویستیان دەست گیری بکەن، فیۆناو وتی: من بە پێی خۆم هاتوم بۆ کۆشک بۆ ئەوەی شوو بە پاشای وڵات بکەم، کەسەربازەکان گوێیان لەم قسەیە بوو پێشوازیان لێکرد، لەبەردەم دەرگای سەرەکی کۆشک پاشا هاتە دەرەوە بە خۆی و باڵا کورتەکەیەوە زۆر خۆشحاڵ بوو دەستی فیۆنای گرت و وتی: بەخێربێیتەوە ئەزیزەکەم، پاشا فەرمانی دا سەرتاسەری وڵات هەموو خانەدانەکان بانگ بکرێن بۆهەفتەی داهاتوو گەورەترین ئاهەنگی بۆ ڕێک بخەن چونکە دەمەوێت جوانترین خانمی ئەم جیهانە بکەمە هاوسەری خۆم. گوێدرێژەکە و شرێک بەتەنها مانەوە، گوێدرێژەکە زۆر بیری فیۆنای دەکرد، شرێخ خەمبار دانیشتبوو هیچی نەدەوت، زۆر نیگەران بوو بەڵام دەری نەدەبڕی دەیویست بگری بەڵام ڕوی نەدەهات، بۆیە داوای لە گوێدرێژی هاوڕێی کرد کە کەمێک بەتەنها بەجێی بهێڵێت، گوێدرێژ چوو بۆ لێواری ڕووبارەکەو شرێکی بەتەنها بەجێ هێشت،**

شرێک وەک منداڵی ساوا دەستی بەگریان کرد بۆ فیۆنا، کاتێک گوێدرێژەکە هاتەوە کەوتە لۆمەکردنی شرێک و پێی وت تۆ بەڕاستی عەشقی فیۆنابویت، بۆچی ئەوە دەشاریتەوە بۆچی بە فیۆنات نەوت خۆشم دەوێیت؟ شرێک وتی: بەڵێ هاورێ وا خەریکە چاوەکانم کوێربن ئەوەندە بگریم من پەشمان لەوەی بە فیۆنام نەوت کە ئەو یەکەم ئافرەتە لە ژیانیدا خۆشیبوێت من زۆر هەڵەم کرد کە دڵی ئەوم شکاند. گوێدرێژ پێشنیاری ئەوەی کرد کەبچن بۆ کۆشکی پاشاو فیۆنا بهێننەوە، شرێک پرسی: ئەوە زۆر مەحاڵە ئێمە چۆن بچین بۆ کۆشک ئەی چۆن ئەو شوێنە بدۆزینەوە؟ گوێدرێژ وتی: من دوو هاورێی زۆر زیرەک و ئازام هەیە، یەکێکیان پشیلەیەکە کە زۆر زیرەکەو ئەوی تریش بە یەک بانگ کردن دێت بۆلامان کە ئەژدیهایەکی باڵدارە زۆر بەهێزە، ئەژدیهاکە هاوکاریمان دەکات بۆ هێنانەوەی فیۆناو پشیلەکەش کون و قوژبنی کۆشک شارەزایە. کاتی ئاهەنگی پاشاو فیۆنا نزیک دەبویەوە فیۆنا بێرەوشتی پاشای ڕۆژ بەڕۆژ بۆ دەردەکەوت، پاشا پیاوێکی تورەو خۆ بەزل زانبوو هەمیشە حەزی لە تورەبون و فەرمان دەرکردن بوو، فیۆنا ڕۆژ بەرۆژ زیاتر بیری شرێکی دەکرد، حەزی دەکرد بگەڕێتەوە بۆلای شرێک بەڵام ڕێگای ئەوەی نەبوو. کاتێک گوێدرێژ بە فیکەیەک بانگی ئەژدیها باڵدارەکەی کرد لە گەڵ شرێک بەرێکەوتن بۆلای پشیلەی هاورێی گوێدرێژ، هەرچواریان بەرێ کەوتن بەرەو کۆش، چونە ناو حەوشەی کۆشک و بڵاوەیان کرد بە چوارلادا بریاریان دا هەریەکەیان کارێک بکەن و لەسەربانی کۆشک چاوەڕوانی یەکتر بکەن بەیەکەوە بگەڕێنەوە، دوای ڕووبەڕووبونەوەیەکی زۆر لەگەڵ پاسەوانەکانی کۆشک توانیان بچنە ناو کۆشکەکەوە، کاتێک شرێک چووە ناو کۆشکەوە بینی کە فیۆنا جلی بوکێنی لەبەردایەو خەریکی ئاهەنگ گێرانە لەگەڵ پاشا شوی پێکردووە، شرێک زۆر نیگەران بوو کاتێک بینی خۆشەویتەکەی لەگەڵ پاشا یە بۆ یە بەرەو دەرەوەی کۆشک گەڕایەوە نەیویست ئاهەنگەکە تێکبدات، لەو کاتەدا فیۆنا شرێکی بینی بەرەو لای شرێک ڕای کرد وتی: خۆشەویستەکەم مرۆڤ بە جوانی و ناشیرینی نییە مرۆڤ بە ڕەوشت بەرزییە لەبەر ئەوەی تۆ ڕەوشتت لە هەموو کەس بەرزترە بۆیە بڕیارمدا شوو بەتۆ بکەم، لەوکاتەی فیۆنا باوەشی بە شرێکدا کردبوو شرێک پێی وت: کە زۆر زۆری خۆش دەوێت لەپێناوی ئەودا چەندین میلی بڕیوە، کە پاشا ئەم دیمەنانەی بەچاوی خۆی بینی فەرمانی دا کە ئەو پیاوە زەبەلەحە بکوژرێت، لەوکاتەدا فیۆنا ماچێکی شرێکی کرد گۆڕانکاریەکی سەیر ڕویدا لە ڕوخساریدا ئەویش ئەوە



بوو که ڕوخساری وەک شرێکی لێهات، که پاشا بینی فۆنا وای لێهاتووه زۆر قێزی لێکردەوەو وتی: ئۆی تۆ چەند کچێکی بێ کەڵک و ناشیرینیت من زۆر قێزت لێدەکەمەوە، هاواری کرد که هەردووکیان بکوژرێن، ئەو پاشایەی که به فیونای دەوت خۆشم دەوێیت و هەموو مەملەکەتەکەم دەکەم به قوربانیت فەرمانی کوشتنی فیۆنای دەرکرد دەی وت: قێزت لێدەکەمەوە، فیۆنا که ئەمەی بینی بۆیی دەرکەوت که کاره باشەکەی کردووه شرێکی هەڵبژاردووه، مۆرڤی چاک به ڕوخسار جوانی و دەسەڵاتداری پاره زۆری نییه بەڵک و به بەڕێزی و ڕەوشت بەرزییه، شرێک و فیۆنا بەرەو سەربانی کۆشک ڕۆشتن و گوێدرێژ و ئەژدیهاو پشیلەکه چاوەڕێیان بوون، گوێدرێژ که فیۆنای بینی زۆر خۆش حاڵ بوو، هەموویان بەیەکەوه چونه سەرپشتی ئەژدیهای باڵدارو بەرو دارستانەکه ڕۆشتن، فییۆنا و شرێک هاوسەرگیریان کرد، ژیانێکی زۆر خۆشیان بەسەر ەبرد، خەڵکی گوندەکەیان زۆر ڕێزیان لێدەگرتن و ڕێگەیان پێدان خانویەکی خنجیله له نزیکی گونده که دروست بکەن، فیۆناو شرێک لەدوای چەندین ساڵ هاوسەرگیری سێ منداڵیان لەیەک بوو بەردەوام بوون له ڕێزگرتن لەیەکتری، منداڵه خۆشەویستەکان دەبێت له فیۆناوه فێری ئەوه ببن که چ کوڕ و یان کچ یان ژن یان پیاو به جوانی نییه یان جوانی شەرتی پیاو یان ژن نییه بەڵک و دەبێت مرۆڤەکان ناخ و دڵ و دەرونیان جوان بێت، زۆر کەس هەن به شێوەو شکڵ جوان نین بەڵام کەسانی زۆر بەڕێز و بەڕەوشتن دەبێت ڕێزیان لێبگیرێت.



# چیرۆکی عەلادین و شازادە یاسەمین

موستەفا، بەرگ دروییەکی زۆر بە توانا بوو، لە یەکێک لە شارەکانی ڕۆژهەلاتی دوور دەژیا، ئەو هەموو ڕۆژ دووکانەکەی زۆر زوو دەکردەوە، بەچالاکی و گەرم و گوڕییەکی زۆرەوە بەرەو کارەکەی دەکەوتە ڕێ، بۆ ئەوەی هەندێک پارە بەدەست بهێنێت بۆ ژنەکەی و منداڵەکەی کە ناوی عەلادین بوو، ئەوان ژیانێکی سەختیان هەبوو وە زۆر هەژار و کەم دەرامەت بوون، پاش چەند ساڵێک موستەفا دەمرێت و نەوەکەی (عەلادین) لە لای دایکی بەجێ دەهێڵێت، چیتر بەرپرسیارەتی و بەخێوکردنی عەلادین کەوتە ئەستۆی دایکی، دایکی عەلادین دەستی کرد بە ئامۆژگاریکردنی و فێرکردنی عەلادین بۆ ئەوەی کوڕێکی لاساری لێ دەرنەچێت، بەڵام عەلادین بەو شێوەیە نەبوو کە دایکی دەیویست، ئەو زۆر تەمەڵ بوو، گوێڕایەڵی دایکی نەدەکرد و زۆر جار لە دەست دایکی ڕایدەکرد و لە بری ئەوەی کە گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی دایکی ڕاگرێت دەچووە دەرەوە لەگەڵ منداڵەکانی دەرەوە یاری و ڕاو ڕاوێنی دەکرد، ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوێکی زۆر باش هاتە ناوچەکەیان،

پیاوەکە ڕیشێکی درێژی هەبوو، خەڵکی ناوچەکە دەست بەجێ هەستیان کرد کە ئەمە کەسێکی نامۆیە، تازە هاتۆتە ئەوێ، ئەم پیاوە کە بە نزیکی عەلادین تێدەپەڕی بینی منداڵەکان هەموو یاری دەکەن، بەڵام عەلادین لە دوورەوە تەماشای دەکردن و بە جل و بەرگێکی دڕاو و پیسەوە تەواو بە جیاواز دەردەکەوت لە منداڵەکانی تر، بۆیە ئەم پیاوە چاکە بەرەو ڕووی عەلادین ڕۆیشت و لێی نزیک بوویەوە، پاشان لێی پرسی ناوت چییە کوڕم؟ عەلادین وەڵامی دایەوەو وتی: ناوم عەلادینە، پاشان لێی پرسی ئەی ناوی باوکت چییە ڕۆڵە؟ عەلادینیش وەڵامی دایەوە و وتی: ناوی باوکم موستەفای خەیات بوو، چەند ساڵێک لەمەو بەر کۆچی دوایی کردووە، دواتر پیاوە چاکەکە عەلادینی کردە باوەش و بە توندی لە ئامێزی گرتو ماچی کرد، وتی خوا لە باوکت خۆش بێت کوڕم، ئەو پیاوێکی زۆر باش بوو، هاوڕێیەکی زۆر نزیکم بوو، پاش ئەمە دەستی عەلادینی گرت و بردی بۆ بازاڕ و جل و بەرگی نوێی بۆ کڕی و پێکەوەش گەڕانەوە بۆ ماڵ، کە دایکی عەلادین کە کوڕەکەی بینی لە باوەشی کەسێکی نامۆدا، زۆر ترساو تووشی دڵەڕاوکێیەکی زۆر بوو، بەڵام پیاوە چاکەکە بە دایکی عەلادینی وت: کە ئەو هاوڕێی نزیکی مێردەکەی بووە، بۆیە دایکیشی دڵی ئارام بوویەو، بە بینینی عەلادین کە جل و بەرگی نوێی لەبەردا بوو زۆر دڵخۆش بوو. دواتر پیاوەکە وتی من هاوڕێی خۆشەویستی موستەفا بووم و ئێستاش پاش بیستنی هەواڵی مردنی لە وڵاتێکی زۆر دوورەوە هاتوومەتە ئێرەوە بۆ پرسەکەی و هەروەها بۆ ئەوەش هاتووم کە ڕێگەم پێ بدەیت تاوەکو عەلادین لەگەڵ خۆمدا ببەم و وەکو کوڕی خۆم بەخێوی بکەم و چاودێری بکەم و هەموو سۆزێکی باوکایەتی پێ بدەم تاوەکو خۆی بە هەتیو نەزانێت. وە هەموو ئەم کارانەشم وەکو چاکەیەکی زۆر کەم وایە بەرامبەر بە چاکانەی کە موستەفای کۆچ کردوو بەرامبەر بە من کردوویەتی لە ڕابردوودا. سەرەتا دایکی عەلادین دوودڵ بوو وە نەیدەویست عەلادین لەو دوور بکەوێتەوە، ئەمەی قبوڵ نەکرد، بەڵام بەهۆی ئەوە کە پیاوە چاکەکە زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە عەلادین بەرێت و زۆر داواشی لە دایکی عەلادین کردو بەڵێنیشی پێ دا کە عەلادینی کوڕی بە زووترین کات بۆ بگەڕێنێتەوە، ناچار هەرچۆنێک بێت ڕازی کرد، پاشان عەلادینی لە باوەش گرتو ماچێکی کردو کەوتنە ڕێ، ئەوەی لێرەدا جێی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە ئەو




پیاوەی کە عەلادینی برد لە ڕاستیدا نە هاوڕێی نزیکی باوکی عەلادین بووە، نە ئەویشی ناسیوە، نە پیاوچاکیش بوو، بەڵکو ئەو پیاوە پیاوێکی جادوگەرەو بە دوای زێڕێکی لەبن نەهاتوودا دەگەڕێت، ئەم پیاوە لە کتێبێکی جادووییدا جارێکیان خوێندبوویەوە کە زێڕێکی زۆر گەورە هەیە لە وڵاتی هندستان، ئەو زێڕەش قۆرییەکی جادووییە و هەرکەسێک بیگاتێ ئەوا دەبێتە خاوەنی هەرچی زێڕو سامانی زەوییە، بەڵام تەنها یەک کەس هەیە کە بتوانێت بگاتە ئەم زێڕە و ئەم شوێنە بدۆزێتەوە ئەویش کوڕێکی هەژارەو ناوی عەلادینەو باوکیشی بەرگ دروویە، کە لە یەکێک لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی دووردا دەژین، بۆیە ئەمیش ئەم هەموو ڕێگەی بڕیوە تاوەکو ئەم کوڕە کە ناوی عەلادینە بیدۆزێتەوە و ئەو قۆرییە جادووییەی کە لە هندستاندا شاراوەتەوە بیدۆزێتەوە بە هۆی ئەمەوە. هەر لە ڕێگەی ئەو کتێبە جادووییەی کە ئەم پیاوەش خوێندبوویەوە توانی عەلادین و ناونیشانی تەواوەتی بدۆزێتەوە، چونکە لە کتێبەکەدا ناونیشانی تەواوەتی عەلادینیش درا بوو، وە بە بینینی عەلادین لە دوورەوە زانی کە ئەوە عەلادینە، وە پاش ئەوەی کە پرسیاری لە بارەی خۆی و باوکی کرد ئەوا بە تەواوی دڵنیا بوویەوە و پاشان بڕیاری دا کە بە هەرشێوەیەک بێت ئەوا پێویستە ئەم کوڕە بەدەست بهێنێت و لەگەڵ خۆیدا بیبات، چەندین ڕۆژ تێپەڕی و عەلادین و پیاوەکەش پێکەوە هەر بەڕێوە بوون، عەلادین لە بارودۆخێکی زۆر خراپدا بوو، قاچەکانی هەمووی تلۆقی کردبوو بە هۆی ئەوەی کە بە بەردەوامی

بەڕێوە بوون بە بێ ئەوەی کە هیچ پشوویەک بدەن، زۆر تینوو و برسی بوو، خەریک بوو لە بێهێزیدا دەکەوت، بۆیە داوای لە پیاوەکە کرد کە یارمەتی بدات و کەمێک و ئاوو و خواردنی بداتێ و بۆ ماوەیەکیش پشوو بدەن، بەڵام ئەو پیاوە چاو چنۆکە تەنها ئاگای لای پارە و زێڕەکەی بوو بۆیە زۆر بە دڵڕەقانە داواکەی عەلادینی ڕەت کردەوە و تووڕەش بوو لێی، وتی پێویستە بەردەوام بێت لەسەر ڕۆیشتن و چیتر خاوە خاو نەکات، پاش بڕینی ماوەیەکی زۆر عەلادین و پیاوەکە گەشتنە شارێک کە زۆر دوور بوو لە ناوچەکەی کە عەلادینی لێ دەژیا، دواتر عەلادین بۆی دەرکەوت کە ماڵی ئەم پیاوە لەم شارەدایە، ئەوە بوو کە پیاوەکە عەلادینی بردەوە بۆ ماڵەوە و کەمێک خواردنی پێدا و دەستی کرد بە فێرکردنی جادوو بە عەلادین، ئەو پیاوە دەیویست عەلادین فێری جادوو بکات بۆ ئەوەی کە بتوانێت لە ڕێگەی ئەوەوە بگاتە ئەو قۆرییە جادووییەی کە لە ژێر خاکدا شاراوەتەوە، بۆیە بە هەموو شێوەیەک هەوڵی دەدا تاوەکو عەلادین فێری ئەو شتانە بکات کە خۆی دەیزانی، چونکە ئەگەر عەلادین ئەو شتانە نەزانێت ئەوا ناتوانێت بەو زێڕانە بگات، پاش ئەوەی کە عەلادین تواناو شارەزایی زۆری پەیدا کرد لە جادودا، ڕۆژێک پیاوەکە عەلادینی برد و دووبارە کەوتنە ڕێ و ڕێگەیەکی زۆر دووریان گرتە بەر، دوای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر زۆریان بڕی گەشتنە ئەو شوێنەی کە پیاوەکە مەبەستی بوو، شوێنەکەش لە ناوەڕاستی دارستانێکی زۆر چڕ دا بوو، پیاوەکە داوای لە عەلادین کرد کە داری بۆ کۆبکاتەوە، ئەویش داواکارییەکەی جێبەجێ کرد و پاشان بە عەلادینی وت کە ئاگرێکی گەورەی بۆ بکاتەوە، ئەویش دەست بەجێ ئاگرێکی گەورەی بۆ کردەوە، لە کاتەدا پیاوەکە هاتە بەردەمی ڕاوەستا و دەستی کرد بە خوێندنی چەند وشەیەکی جادوویی کە تەنانەت عەلادینیش نەیدەزانی کە چییە، لە پڕ ئاسمان تاریک بوو، دەنگێکی زۆر گەورە لە ئاسمانەوە هات کە خەریک بوو گوێیەکانی عەلادینی کەڕ دەکرد، دواتر زەوییەکەی ژێریان درزێکی گەورەی تێبوو کە تارماییەکی گەورە لەناو درزەکەدا پەیدا بوو، لەوکاتەدا پیاوە جادووگەرەکە زۆر ترسا و هاتە نزیک عەلادین و ئەنگوستیلەیەکی جادووی لە دەست کرد و پێی وت: ئەم ئەنگوستیلەیە تۆ دەپارێزێت، دواتر داوای لێکرد کە عەلادین بچێتە ناو ئەو درزە گەورەیەی کە لە زەوییەکەدا دروستت بووبوو، پێی وت: تا کۆتایی ئەم درزە



بڕوات و له کۆتایی درزەکەدا ڕێگەیەکی لێیە کە ڕاستەوخۆ بە قۆرییە جادووییەکەی دەگەیەنێت، هەروەها عەلادینیشی ئاگادار کردەوە کە لەگەڵ دۆزینەوەی قۆرییەکەدا بە خێرایی لە درزەکە بێتە دەرەوە و قۆرییەکەش لەگەڵ خۆیدا بهێنێتە دەر بۆ ئەم. عەلادینیش سەرەڕای ئەوەی کە ترس و لەرزێکی زۆر دایگرتبوو گوێڕایەڵی پیاوە جادوگەرەکەی کرد و چووە ناو درزەکەوە. عەلادین چووە ناو درزە قووڵەکەوە، زۆر تاریک و ترسناک بوو بۆیە عەلادین بە پەلە تا کۆتایی درزەکە چوو، وە لەوێدا قۆرییە جادوویەکەی دۆزییەوە و دڵی خۆش بوو، وە بە خێرایی گەڕایەوە بۆ لای جادوگەرەکە، لەوێدا داوای لە جادوگەرەکە کرد کە یارمەتی بدات بۆ ئەوەی کە لە چاڵەکەدا بێتە دەرەوە، بەڵام جادوگەرەکە داواکەی ڕەت کردەوە و وتی: سەرەتا قۆریەکەم بدەرێ پاشان یارمەتیت دەدەم و لە چاڵەکەدا دەرت دەهێنم. لەم کاتەدا عەلادین زۆر ترسا و هەستی بەوە کرد کە پیاوە جادوگەرەکە بە نیازە کە فێڵی لێ بکات و دەری نەهێنێت لە چاڵەکە، پاش ئەوەی کە چەندین جار پیاوە جادوگەرەکە داوای لێ کرد و عەلادینیش داواکارییەکەی جێبەجێ نەکرد بەوەی کە سەرەتا قۆرییەکەی پێ بدات و پاشان یارمەتی بدات بۆ هێنانە دەرەوەی، پیاوەکە زۆر تووڕە بوو



وە دەیزانی کە عەلادین هەستی بەوە کردووە کە ئەم دەیەوێت قۆرییەکەی دەست بکەوێت و پاشان یارمەتی عەلادین نەدات و هەر لەوێدا بیکوژێت، بۆیە بە تەواوی لەوە بێ ئومێد بوو کە عەلادین قۆرییەکەی پێ بدات، ئەوە بوو دەست بەجێ دەستی کردەوە بە خوێندنەوەی وتە جادووییەکانی و پاشان تاکە ڕێی چوونە دەرەوەی عەلادین داخرا بەسەریدا و زەوییەکە وەک خی لێهاتەوە و هیچ ڕێگای دەرباز بوونی نەما، لەم کاتەدا عەلادین زۆر ترسا و هەستی بە نائومێدی کرد کاتێک گوێی لە دەنگی پێی پیاوە جادەگەرەکە بوو کە لێی دوورکەوتەوە و لە ناوچەکەدا نەما. عەلادین لە ناو تاریکاییەکی زۆر ترسناکدا لە ژێر زەوی بە تەنیا مایەوە و گیری خوارد, تا دەهات زیاتر دەترسا و بە خۆی دەگوت کە تەواو چیتر ئەو ناتوانێت ڕزگاری بێت و لەو چاڵەدا بێتە دەرەوە بۆیە خەمێکی زۆر دایگرت و لە گۆشەیەکدا دانیشت. تەنها شتێک کە عەلادین بیری لێکردەوە قۆرییەکە بوو، کە پێویستە بە هەر شێوەیەک بێت شتێکی لێ بکات، ئەو دەیزانی کە ئەم قۆرییە جادووییە و زۆر گرنگ بوو بۆ پیاوە جادوگەرەکەش، بۆیە دەستی کرد بە گەڕان بە ناو قۆرییەکە و لەو کاتەدا عەلادین دەستێکی بە قۆرییەکەدا هێنا بۆ ئەوەی پاکی بکاتەوە و ئەو خۆڵ و خاشاکەس کە پێوەی بوو لایبەرێت، لە پڕ دەنگێکی گەورە هات و ئەمیش لە ترسا



قۆرییەکەی فڕێ دا لە دەستی، ئەوە بوو لە چاو تروکانێکدا و لە ناو دووکەڵ و ڕووناکییەکی زۆر لە قۆرییەکە هاتە دەرەوە دێوێکی گەورە پەیدا بوو، لەپڕ وتی من خزمەتکاری هەڵگری ئەم قۆریەم، هەرچییەکت دەوێت فەرمانم پێ بکە تا بۆت جێبەجێ بکەم، ئەوە بوو عەلادین دڵی خۆش بوو وە ئومێدی بۆ گەڕایەوە و داوای لە دێوەکە کرد کە ئەو بگەڕێنێتەوە بۆماڵەکەی خۆیان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دوور. پاش ئەوەی عەلادین داوای لە دێوەکە کرد کە بیباتەوە بۆ ماڵی خۆیان و لەو چاڵەدا ڕزگاری بکات، دێوەکە لە چاوتروکانێکدا عەلادینی گەڕاندەوە بۆ ماڵی خۆیان و بە دایکی شاد بوویەوە و عەلادینی لە باوەش گرت، دایکی عەلادین دڵی زۆر تەنگ بووبوو بۆ عەلادین و بە بینینەوەی زۆر شاد بوووە لەخۆشیدا نەیدەزانی چی بڵێت، دواتر عەلادین کە بینی دایکی برسییەتی و هیچیشیان لەماڵەوە نییە کە بیخوات، بۆیە دەستێکی بە قۆرییەکەدا هێنایەوە و پاش ئەوەی کە دێوەکە دەرکەوتەوە داوای لێ کرد کە دوانزە سینی ئاڵتوونی پڕ لە خواردنی خۆش و جۆراوجۆریان بۆ ئامادە بکات، ئەوە بوو لە چاوتروکانێکدا دێوەکە داواکەی عەلادینی جێبەجێ کرد و دوانزە سینی ئاڵتوونی کە پڕ بوون لە خواردنی جۆراوجۆر و ڕازێنرابوونەوە ئامادە کرد و لەبەردەمیان داینا، دایکی بەمە زۆر سەرسام بوو، وە عەلادینیش تەواوی مەسەلەکەی بۆ باس کرد. بۆ ڕۆژی دواییش عەلادین سینییە ئاڵتوونییەکانی بردە بازاڕ و هەمووی فرۆشت و پارەیەکی باشی دەست کەوت و بۆ ماڵەوەی



هێنایەوە. لەمە بە دواوە ژیانی عەلادین و دایکی بە تەواوەتی گۆڕا و ژیانیان زۆر خۆش بوو. عەلادین دەچوو بۆ شوێنی ئاڵتون و گەوهەرکەو لێی دەهێنان و بەسەرماڵە هەژارەکاندا دابەشی دەکرد، عەلادین بەردەوام هاوکاری هەژارانی دەکرد، ژیانی چەندین گەدای لەمردن ڕزگار کرد، چەندین سکی برسی تێر دەکرد. ڕۆژێکیان عەلادین بە بەردەم کۆشکی پاشادا تێدەپەڕی لە بەردەم پەنجەرەی کۆشکدا چاوی بە کچێکی زۆر جوان و بێ وێنە کەوت کە کچی پاشا بوو ناوی یاسەمین بوو، یاسەمین کچە تاقانەکەی پاشا بوو، زۆر نازدار بوو لەلای باوکی زۆر خۆشەویست بوو، خاتو یاسەمین خاوەنی لەشولارێکی جوان بوو دوچاوی دڵفرێنی هەبوو، یاسەمین کچە تاقانەکەی پاشا، پڵنگێکی ماڵی هەبوو کە یاسەمین زۆر خۆش دەویست، یاسەمین زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ پڵنگەکەیدا لە کۆشکەکەی باوکیدا بەسەر دەبرد، عەلائەدین هەر لەیەکەم بینینی یاسەمینەوە زۆر زۆر حەزی لێکرد و بە خێرایی گەڕایەوە ماڵەوە و پاش ئەوەی کە بە دایکی وت، دایکیشی ئەمەی بە کارێکی زۆر سەخت زانی، بە عەلادینی وت کە ئەو کچە کچی پادشایە و کەس ناتوانێت بچێتە داوای چونکە پاشا داوای زێر و سامانێکی زۆر دەکات لە لایەن ئەو کەسەی کە دێتە داوای کچەکەی، پاشان عەلادین دەستی بە قۆرییەکەدا هێنا و بە دێوەکەی وت: کە زێرێکی زۆری بۆ ئامادە بکات و ئەویش لە چاوتروکانێکدا بۆی ئامادە کرد، عەلادین زۆر بەمە دڵخۆش

بوو وە خۆی و دایکی کەوتنە ڕێ بۆ کۆشکی پادشا، کە گەشتنە ئەوێ دایکی عەلادین بە پاشای وت کە کوڕەکەی کە ناوی عەلادینە هاتۆتە داوای کچەکەی و بۆ ئەو مەبەستەش زێڕێکی زۆری بۆ هێناوە بە شێوەیەک کە هیچ کەسێک تا ئێستا ئەوەندە زێڕی نەبەخشیوە بۆ خواستی کچی پادشا، کە پاشا چاوی بەو هەمووە زێڕە کەوت دەستبەجێ ڕازی بوو وە وتی: من ڕازیم بەوەی کە کچەکەی خۆم بدەم بە کوڕەکەت، وە عەلادینیش زۆر سەرسام و دڵخۆش بوو بەمە. پادشا وەزیرێکی زۆرزانی ناشیرنی هەبوو، کە پێشووتر حەزی لە یاسەمینی کچەکەی پادشا کرد بوو بەڵام نەیتوانیبوو بچێتە داوای، بۆیە بە بینینی ئەم ڕووداوە و ئەوەی کە عەلادین خەریکە دەبێتە زاوای پادشا، زۆری پێ ناخۆش بوو وە دەستی کرد بە پیلان گێران لە دژی عەلادین، ئەوە بوو چوو بۆ لای پادشا و پێی وت: کە کچەکەی تۆ زۆر لەو زێڕانە بەقیمەت ترە کە عەلادین بۆی هێناویت، پێویستە کە بەوە ڕازی نەبیت و داوای زۆر زیاتری لێ بکەیت، بەم جۆرە قسانە تەماحی خستە خەیاڵییەوە. پادشاش ئەم قسانەی کە وەزیرەکەی کردی کاری تێکرد و داوای کرد کە دایکی عەلادینی بۆ بانگ بکەن، پاشان کە دایکی عەلادین هات، پادشا پێی ڕاگەیاند کە نرخی کچەکەی زۆر بەقیمەترە لەو زێڕانەی کە عەلادین بۆی هێناوە، بۆیە داوای لە دایکی عەلادین کرد کە پێویستە عەلادین ٤٠ سندوقی پڕ لە خشڵ و زێڕ کە ٤٠ بەندە لەسەرشانیان هەڵیان گرتبێت و بە جوانترین شێوە و جل و بەرگەوە بێنە ناو کۆشکەوە. دایکی عەلادین کە ئەمانەی لە پادشا بیست زۆر سەرسام بوو، کە ئایا پادشا بۆ قسەی خۆی گۆڕی و بۆچی ئێستا داوای ئەو بڕە زۆرە خشڵ و زێڕە دەکات، لەم کاتەدا وەزیرەکەی پادشاش زۆر دڵی خۆش بوو، چونکە دەیزانی کە عەلادین لە توانایدا نییە کە ئەو بڕە زۆرە زێڕە ئامادە بکات، بۆیە پادشاش کچەکەی خۆی ناداتێ و لە بری ئەوە بۆ ئەم دەبێت. دواتر دایکی عەلادین بە دوودڵی و خەم و پەژارەوە بە عەلادینی ڕاگەیاند کە پادشا داوای ئەو بڕە زۆرە خشڵ و زێڕە دەکات، بەڵام عەلادین زۆر لای ئاسایی بوو وە دایکی دڵنیا کردەوە کە دەتوانێت ئەو کارە بکات و هەموو ئەو خشڵ و زێڕانەش بۆ پادشا ئامادە بکات، ئەوە بوو پاش چەند چرکەیەک بە هۆی قۆرییە جادووییەکەیەوە توانی هەموو ئەو شتانە ئامادە بکات کە پادشا داوای کردبوو، وە بەرەو کۆشک کەوتنە ڕێ. عەلادین لە پێش هەموویانەوە



ڕێی دەکرد و ٤٠ بەندەش کە ٤٠ سندوقە پڕ لە خشڵ و زێڕەکەیان هەڵگرتبوو بە دوایەوە ڕێیان دەکرد بەرەو کۆشک، هەموو خەڵکی شار بە بینینی ئەم دیمەنە سەرسام بوون. کە عەلادین و قافڵەکەی گەشتنە ناو کۆشک و هەموو زێڕەکانی پێشکەش کرد، پادشا دەست بەجێ ڕازی بوو وە لە سەراسەری وڵات ئاهەنگ و خۆشی ڕاگەیاند بەو بۆنەیەوە. وە لە مە بەدواوە عەلادین و یاسەمینی کچی پادشا پێکەوە بە خۆشی بژین. لەلایەکی ترەوە پاش ئەوەی کە پیاوە جادوگەرەکەی کە عەلادینی لە چاڵەکەدا بەجێ هێڵاو ڕێگەی دەربازبوونی لێ داخست، گەڕایەوە ماڵ خۆیان و بە دڵنیاییەوە وایدەزانی کە عەلادین لە ناو چاڵەکەدا مردووە، بەڵام پاش ئەوەی کە دووبارە دەستی کردەوە بە خوێندنەوەی کتێبی جادوویی بۆی دەرکەوت کە عەلادین نەمردووە و ئێستا بووەتە زاوای پادشا و لە کۆشکێکی زۆر خۆشدا ژیان بەسەر دەبات و کچی پاشا ژنێتی، کە بەمانەی زانی زۆر تووڕە بوو، وە بڕوای نەدەکرد کە ئەمە ڕووی داوە، بۆیە بڕیاری دا کە تۆڵەی لێ بسەنێتەوە. ئەوەبوو کە ڕێگەیەکی زۆر زیرەکانەی دۆزییەوە، ڕۆژێک کە عەلادین لە ماڵەوە نەبوو، ئەم پێی زانی و کەوتە ڕێ بۆ نزیک کۆشک، لەوێدا جلێکی شڕی لەبەر کردبوو، وە هاواری دەکرد کێ قۆری کۆنی هەیە یان فەرش و قوماش بیفرۆشێو من دەیکڕم، بە هەمان شێوە بە دەروی کۆشکدا دەسوڕایەوە، تاوەکو ژنەکەی عەلادین گوێی لێ بوو، وتی خۆ ئێمە

قۆرییەکی ناشرین و کۆنمان هەیە بۆچی نەیفرۆشم! لەم کاتەدا ژنەکەی عەلادین قۆرییەکەی عەلادینی هێناو وتی چیتر با ئەم قۆرییە ناشرین و کۆنە لەم ماڵەماندا نەمێنێت چونکە ماڵەکەمان زۆر جوانەو لەگەڵ ئەم قۆرییە کۆنەدا ناگونجێت بۆیە باشتر وایە کە بیفرۆشم، ئەوەی کە ژنەکەی عەلادین نەیدەزانی و بێ ئاگا بوو لێی ئەوە بوو کە نەیدەزانی نهێنی خۆشبەختی ئەوان و عەلادینیش تەنها بە هۆی ئەم قۆرییە کۆنەوەیە، هەرچۆنێم بێت قۆرییەکەی برد بۆ پیاوە جادوگەرەکە کە خۆی کردبووە کەسێکی زۆر فەقیر و شتی کۆنە دەکرێت، بۆیە دەست بەجێ قۆرییەکەی بە پارەیەکی باش لێ کڕی و دوور کەوتەوە لەو ناوچەیە. کە ئێوارە عەلادین گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و چووە ئەو ژوورەی قۆرییەکەی لێ دانابوو دەست بەجێ هەستی کرد بەوەی کە قۆرییەکە لە شوێنی خۆیدا نەماوە، بۆیە زۆر ترسا و خەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرت، بۆیە بە پەلە بە ژنەکەی وت: کە ئایا ئەو دەزانێت قۆرییەکە لە کوێیە یان نا، ئەویش پێی وت: کە قۆرییەکەی فرۆشتووە چونکە لەگەڵ جوانی و ڕازاوەیی ماڵەکەیاندا نەدەگونجا، وە هیچ ڕۆژێکیش عەلادین بەمی نەوتبوو کە ئەو قۆرییە چییە و چەنێک گرنگە، بۆیە بە بێ ئاگایی فرۆشتبووی، عەلادین کە بەمەی زانی هێندەی تر خەم و پەژارە و دڵەڕاوکێیی زیادی کرد، وە هێندەی نەبرد کە شتێکی زۆر چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا، کە پیاوە جادووگەرەکە گەیشتەوە ماڵەوە دەستی بە قۆرییەکەدا هێنا و بە دێوەکەی وت کە هەرچی کردووە بۆ عەلادین هەمووی وەکو خۆی لێ بکاتەوە و عەلادینیش بخاتەوە دۆخی فەقیری جارانی و کچی پادشاشی لێ بسەنێتەوە. ئەوە بوو دەستبەجێ دێوەکە داواکارییەکانی پیاوە جادوگەرەکەی جێبەجێ کرد و عەلادینی لە چاوتروکانێکا خستەوە بارودۆخی جارانی و هەموو شتێک گەڕایەوە بۆ دۆخەکەی جارانی. عەلادین بەمە زۆر سەرسام بوو وە تووشی نارەحەتییەکی زۆر بوو، کە لەو ژیانە خۆشەیەوە گەڕایەوە بۆ ژیانی فەقیری و هەژاری هەروەک جارانی، بۆیە بیری لە شتێکی زۆر زیرەکانە کردەوە ئەویش ئەو ئەنگوستیلە جادووییە بوو کە پیاوە جادوگەرەکە پێش ئەوەی کە عەلادین بچێتە چاڵەکە وە کردییە دەستییەوە، عەلادین بیری کردەوە لەوەی کە بەڵکو بتوانێت لە ڕێگەی ئەم ئەنگوستیلە جادووییەوە تۆڵەی خۆی لە پیاوە جادوگەرەکە بسەنێتەوە، ئەوەی جێی سەرنج بوو لێرەدا ئەوە بوو کە ئەم ئەنگوستیلە لە دەستی



عەلادیندا خاوەنی توانایییەوە زۆر بوو بە شێوەیەک کە عەلادینیش هەستی پێ نەکردبوو، بۆیە دەستێکی پێدا هێناو دێوێکی گەورە دەرکەوت و وتی لە خزمەتتدام گەورەم، ئەمیش دەستبەجێ داوای لێ کرد کە قۆریەکەی لە هەرشوێنێکە بۆی بگەڕێنێتەوە، و لە ماوەی چاوترووکانێکدا قۆرییەکەی بۆ گەڕاندەوە. عەلادین بەمە زۆر دڵی خۆش بوو، وە بە خێرایی داوای لە دێوەکەی قۆرییەکە کرد کە هەموو شتەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە و وەک خۆی لێ بکاتەوە و ئەویش داواکارییەکەی جێبەجێ کرد. عەلادین گەرایەوە بۆ کۆشک و بۆ لای یاسەمینی کچەکەی پادشا و لە ناو کۆشکەکەی خۆیدا و بۆ ژنەکەی ڕوون کردەوە کە ئەمان جادوویان لێکراوە بۆیە وایان لێ هات بەڵام ئێستا هەموو شتێک چارەسەر بووە و گەڕاونەتەوە بۆ دۆخە خۆشەکەی پێشوویان، چیتر بڕیاری دا کە بۆ هەمیشەیی ئەو ئەنگوستیلەیە لە دەست بکات و قۆرییەکەش لە شوێنێکی زۆر نهێنی و پارێزراودا هەڵ بگرێت کە هیچ کەسێک پێی نەزانێت. لەمە بە دواوە عەلادین و ژنەکەی و دایکی بە ژیانێکی زۆر خۆش، لە ناو کۆشکی پادشاییدا و دوور لە هەموو ناڕەحەتی و ناخۆشی و کێشەیەک درێژەیان بە ژیانیان دا و پیاوە جادوگەرەکەش هیچی بۆ نەمایەوە و بۆ هەمیشەیی بە بێ دەسەڵاتی مایەوە.

